

## دەستوورمان لە بەردەستماندایە

رەشنووسی

# دەستووری کۆماری عیراق



دەستوورمان چەترمانە



# دیباجه

## بەناوی خودای بەخشندە و دلۆڤان

﴿ ولقد كرمنا بني ادم ﴾

ئێمە ڕۆڵەکانی میزۆپۆتامیـاین، کـە نشـینگەی پێغەمبـەران و ئارامگای پێشەوایانی پاکیزەو پێشڕەوانی شارسـتانیەت و داهێنـەرانی نووسین و لانکەی ژمارەدانان بووه و، لەسـەر خاکمانـدا مرۆڤـ یەکـەم یاسای داناوه وله نیشتمانی ئێمەدا کۆنترین سەردەمی دادپەروەریی بۆ سیاسەتی وڵاتان تۆمار کراوەو یاوەران و ئەولیاکان لەسەر خاکەکەماندا نوێژیان دابەستووە و پیتۆل و زانایانیش تیۆریان دارشـتووه و ئـەدیب و شاعیرانمان داهێنانیان کردووه. له سـۆنگەی پێزانیمـان بـەمافی خـودا بەسەرمانەوەو بەپیرەوە چوونی بۆ بانگەوازی نیشـتمان و هاولاتیانمـان و وەلامگۆییمان بـۆ بانگهێشـتی سـەرکرده ئـاینی و ولاتپارێزەکانمـان و سووربوونی سەرچاوە (پیر-مرجع) مەزنەکان و رابەران و چاکسـازانمان و هێزە نیشتمان پەروەرو سیاسەتمەدارەکانمان و، لەنێوەندی پشتیوانییەکی جیهانیی دۆست و خوشەویسـتانمان ، بـۆ یەکـەمین جـار لەمێژومانـدا ملیۆنەها کەس بە پیاوو ژن و لاوو پـیرەوه لـە 30/کـانوونی دووەمـی ساڵی 2005ی ز دا بەرەو سندوقەکانی دەنگـدان چـووین و هـەر لـەو ساتەشدا ئێش و ئازاری داپلۆسـینی تایفەگـەری تـاقمی سـتەمکارمان لەیاد بوو، هەروەها پەژارەی شـەهیدانی عێـراق لـە شـیعەو سـوننە ، عارەب و کورد و تورکمان و براکانی دیکەیان لەهـەموو پێکهاتەکانـدا

کـرد بــه ڕێنیشــاندەر ، و تــاوانی خــاپور کردنــی زۆردارانــەی شــارە پیرۆزەکانی باشوور لە ڕاپــەڕینی شــەعبانی و زۆنگاوەکــان و دوجیــل و ئــەوانی دی بوونــە سروشــدەر و ئازارەکــانی داپلۆســینی نەتــەویی لــە کوشتارگەکانی هەڵەبجە و بارزان و ئەنفال و کوردە فەیلیەکان بــەدەنگی هێناین و مەینەتیەکانی تورکمانەکان لــە بەشــیر بوونــە ڕێنوێنیمــان ، هەروەکو لە ناوچەکانی دیکەی عێراقیشدا، خــەڵکی ناوچــەی خۆرئــاوا گیرۆدەی لەنێوبردنی سەرکردەو سونبلان و شێخەکانیان وئــاوارە کردنــی خاوەن بەهرەکانیان و وشك کردنی سەرچاوە گــەلی هــزرو فەرهــەنگیان بوون، بۆیە هەمووومان پێکــەوە دەســت لــە نــاو دەســت وشــان بەشــان تێکۆشاین بۆ ئەوەی عێراقی نوێمان دروست بکەین، عێراقی دواڕۆژ بێ لاف و گەزافی تایفەگەری و بێ خواستی ڕەگەزپەرستی و گرێ و گــوڵی ناوچەگەرێتی و بێ جیاکاری و وەلانان، کوفراندن و تیرۆریزم ڕێگەی پــێ نەگرتین بەرەو بنیادنانی دەوڵەتی یاسا بڕۆینە پێشــەوە و تایفەگــەری و ڕەگەزپەرســتیش نــەی وەســتاندین لــەوەی پێکــەوە بــەرەو پتــەوکردنی یەکێتی نیشتمانی بڕۆین و شێوازەکانی دەستاودەستکردنی ئاشــتیانەی دەسەڵات بگرینە بــەر و شــێوەی دابەشــکردنی دادپەروەرانــەی ســامان پیڕەو بکەین و هەلی یەکسان بۆ هــەمووان بڕەخســێنین. ئێمــەی گــەلی عێراق کە تــازە لــە کــەوتن هەڵســاوەتەوە و بــە بــڕواوە لــە ئایینــدەی دەروانێــت، لەمیانــەی سیســتەمێکی کۆمــاری فیــدراڵی دیموکراســی فرەلایەنی دا لە ئایندەی دەروانێت، بە پیاوو ژن و پیرو لاوانییەوە پێیان داگرتووە لەسەر ڕێزگرتنی ڕێساکانی یاسا و توڕدانی سیاســەتی دەســت درێژی بایەخدان بە ئافرەت و مافەکانی و پــیرو خەمــەکانی و منــداڵ و پێداویســتییەکانی، هــەروەها بڵاوکردنــەوەی فەرهــەنگی هەمــەجۆر و بنەبڕکردنی تیرۆر.

ئێمەی گەلی عێراق کە پەیمانی بە خۆداوە بەهەموو پێکهاتە و ڕەنگەکانیەوە بە ئازادی و ئارەزومەندانە بڕیاری فیدرالیەتی خۆی بدات و پەندی سبەینیێ لە دوێنێ وەرگرێت و لە کۆیەندی بەهاو و نمونەییە باڵاکانی پەیامە ئاسمانییەکان و هەروەها لە داهێنانەکانی زانست و ژیاریی (شارستانی) مرۆڤ ئەم دەستورە هەمیشەییە دابنێت کە پابەندبوون بەم دەستورە یەکێتی سەربەستانەی گەل و خاک وسەروەری عێراق دەپارێزێت.

# بەشی یەکەم

# سەرەتا بنچینەیی یەکان

**ماددەی** ( 1 )

کۆماری عێراق دەوڵەتێکی سەر بە خۆو شکۆدارە، سیستەمی حوکمڕانی تیایدا کۆماری نوێنەرایەتی (پەرلەمانی) دیموکراسی فیدراڵیە.

**ماددەی** ( 2 )

یەکەم ـ ئیسلام ئاینی فەرمیی دەوڵەتە، و سەرچاوەیەکی بنەرەتییە بۆ یاسادانان:

أ- نابێت یاسایەك دەرچێت لەگەڵ حوکمە نەگۆڕەکانی ئیسلام دا ناکۆك بێت .

ب-نابێت یاسایەك دەرچێت لەگەڵ سەرەتاکانی دیموکراسی دا ناکۆك بێت.

ج- نابێت یاسایەك دەرچێت لەگەڵ ئەو ماف و ئازادیە بنەرەتیانە دا کە لەم دەستورە دا هاتوون ناکۆك بێت.

دووەم ـ ئەم دەستورە پاراستنی ناسنامە ئیسلامیەکەی زۆرینەی گەلی عێراق مسۆگەر دەکات، هەروەها سەرجەم مافە ئایینیەکان بۆ گشت تاکەکان وەکو مەسیحی و ئێزیدی و سابیئە مەندائییەکان لە ئازادی باوەڕو پیادەکردنی کارەکانی ئاینی مسۆگەر دەکات.

**ماددەی ( 3 )**

عێراق وڵاتێکی فرە نەتەوە و فرە ئایین و ئاینزایە و، بەشێکە لە جیهانی ئیسلامی و ئەندامێکی دامەزرێنەرو کارای کۆمکاری عەرەبی یەو پابەندی بەڵێننامە (میساقە) کەیەتی.

**ماددەی ( 4 )**

یەکەم ـ هەردووك زمانی عارەبی وزمانی کوردی زمانی فەرمین لە عێراق دا، مافی عێراقیەکانیش بەفێرکردنی رۆڵەکانیان بە زمانی دایك وەك تورکمانی و سریانی و ئەرمەنی لە دامەزراوە حوکومەتییەکانی فێرکردندا مسۆگەر دەکات بەپێی رێوشوێنەکانی پەروەردەیی ، یان بەهەر زمانێکی دیکە لە دامەزراوە تایبەتەکانی فێرکردندا.

دووەم ـ چوارچێوەی زاراوەی زمانی فەرمی و چۆنیەتی پیادەکردنی حوکمەکانی ئەم بەندە بە یاسا دیاری دەکرێت و ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- دەرچواندنی رۆژنامەی فەرمی بەو دوو زمانە .

ب- پەیڤین و گوتارو دەربرین لە بوارە فەرمیەکاندا وەك ئەنجومەنی نوێنەران، ئەنجومەنی وەزیران، دادگاکان و کۆنگرە فەرمیەکان بە هەر یەك لەم دوو زمانە بێت.

ج- دان پێدانان بە دیکۆمێنتی فەرمی و نووسراوەکان بە هەر دوو زمان و دەرچواندنی دیکۆمێنتە فەرمیەکان بە هەردووکیان.

د- کردنەوەی خوێندنگاکان بە هەر ذوو زمان بەپێی رێوشوێنە پەروەردەیی‌یەکان.

ه- هەر بوارێکی دیکە کە سەرەتای یەکسانی پێویستی دەکات وەك دراوی کاغەز، پەساپۆرت و پول.

سێیەم ـ دامەزراو و دەزگاكانی فیدرالی لە هەرێمی كوردستان
هەردوو زمانەكە بەكار دێنن .
چوارەم ـ زمانی توركمانی و زمانی سریانی دوو زمانی فەرمی
دیكەن لەو یەكە كارگێڕ بیانەی كە چڕیی دانیشتوانەكانیان
پێك دێنن.
پێنجەم ـ بۆ هەر هەرێمێك یان پارێزگایەك هەیە هەر زمانێكی
ناوچەیی دیكەش بە زمانی فەرمی بناسێت ئەگەر بێتو
زۆرینەی خەڵكەكەی بەراپرسیەكی گشتی بریاری لەسەر
بدات.

**ماددەی ( 5 )**

سەروەری بۆ یاسایە و گەلیش سەرچاوەی دەسەڵاتەكان و
رەواییەكیەتی كە لەرێگەی دامەزراوە دەستورییەكانەوە و
بەدەنگدانی نهێنی گشتی راستەوخۆدا ئەنجام دەدرێت.

**ماددەی ( 6 )**

دەستاو دەستكردنی دەسەڵات ئاشتیانە تەواو دەبێت بەو رێگا
دیموكراسیانەی لەم دەستورە دا دەقنوس كراون .

**ماددەی ( 7 )**

یەكەم ـ هەر قەوارە یان رێبازێك قەدەغە دەكرێت ئەگەر رەگەز
پەرەستی یان تیرۆریزم یان كوفراندن یان پاكتاوی تایفەگەری
پێڕەوبكات یان هانیان بدات یان رێخۆشكەرییان بۆ بكات یان
بەرزیان بنرخێنێ یان پروپاگەندەیان بۆ بكات یان پاساویان بۆ
بێنێتەوە بەتایبەتی (بەعسی سەدامی) لە عێراق و نمونەكانی
لە ژێر هەر ناوێك دا بێت و نابێت ئەمە لە نێو فرەلایەنی
سیاسی بێت لە عێراقدا ، ئەمەش بە یاسا رێك دەخرێت.

دووەم ـ دەوڵەت پابەند دەبێت بە شەڕی تیرۆر بەگشت شێوەکانیەوە و کاریش بۆ ئەوە دەکات خاکی خۆی بپارێزێت لەوەی کە ببێتە بارەگای یان ڕێڕەو یان گۆڕەپانی چالاکیەکانی.

**ماددەی** ( 8 )

عێراق سەرەتاکانی خۆش دراوسێیی ڕەچاو دەکات ، وپابەندە بە دەست تێوەر نەدانی کارو باری ناوخۆیی ولاّتانی دیکەوە وهەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوازێکی ئاشتیانە دەدات وپەیوەندیەکانیشی لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە هاوبەشەکان و مامەڵە کردنی هاوشێوە سازدەدات وڕێزیش لە پابەندییە نێو دەوڵەیتیەکانی دەگرێ.

**ماددەی** ( 9 )

یەکەم ـ

أ- هێزی چەکداری عێراقی ودەزگاکانی ئاسایش لە پێکهاتەکانی گەلی عێراق پێك دێت، بەڕەچاوکردنی هاوسەنگی و هاوشێوەییان بەبێ جیا کاری یان وەلانان و لەژێر سەرکردایەتی دەسەلاّتی مەدەنی دا دەبێت و بەرگری لە عێراق دەکات و نابێتە ئامرازێکی سەرکوتکەری گەلی عێراق و دەست لە کاروباری سیاسیش وەرنادات و هیچ ڕۆڵێکی نابێت لە دەستاودەستکردنی دەسەلاّتدا .

ب-ڕێگە بە پێکهێنانی میلیشیای سەربازی نادرێت لە دەرەوەی چوارچێوەی هێزە چەکدارەکاندا .

ج- نابێت هێزە چەکدارە عێراقیەکان و تاکەکانی لە نێویاندا ئەو سەربازانەی لە وەزارەتی بەرگری دا یان لە هەر فەرمانگە و ڕێکخراوێکی سەر بەودا کارگێڕبن خۆیان کاندید بکەن لە هەڵبژاردنەکاندا بۆ بەدەستگرتنی هەر

ناوەنـدێکی سیاسـی و بۆشـیان نیـە بـە هەڵمەتـەکانی هەڵبژاردن هەڵسن لە بەرژەوەندی ئەو پاڵێوراوانەی هەیانە و نابێت بەشداری لەو کارانەشدا بکەن کە ڕێنماییـەکانی وەزارەتـی بـەرگری ڕێگـەی پـێ نـادات، ڕێگـە نـەدان چالاکیەکانی ئەو تاکانـەش دەگرێتـەوە کـە لـە سـەرەوە باسیان کراوە بە سیفەتی کەسێتی یان کارەکەی خۆیان بێ ئەوەی ئەوە بگرێتـەوە کـە مـافی خۆیـان لـە دەنگـدانی هەڵبژاردنەکان لە دەست بدەن.

د- دەزگای هەواڵگری نیشـتمانی عێراقـی هەڵدەسـتێت بـە کۆکردنەوەی زانیاری و هەڵسـانگاندنی ئـەو هەرەشـانەی ڕووبەڕوی ئاسایشـی نیشـتمانی دەبنـەوە و ڕاووشـۆڕەت پێشکەش بەحکومەتی عێراق دەکات ولە ژێـر کـۆنترولی مەدەنی دا دەبێت و دەکەوێتە ژێـر چـاودێری دەسـەڵاتی یاسـادانانەوە و بـەپێی یاسـاو سـەرەتا دان پێنراوەکـانی مافی مرۆڤـی کاردەکات.

هـ- حکومـەتی عێـراق ڕێـز دەگـرێ لـە پابەنـد بوونـە نێودەوڵەتییەکانی، ئەوانـەی تایبـەتن بـە قەدەغـەکردنی بڵاوبوونەوە و پەرەپێدان و بەرهەم هێنان و بەکار هێنـانی چەکی ئـەتۆمی و کیمیـاوی و بـاییۆلۆژی و جێبـەجێیان دەکات و ڕێگەش دەگرێت لە هەر شتێك پەیوەسـت بێـت بـە پەرەپێـدان و دروسـت کـردن و بەرهـەم هێنـان و بەکارهێنانییـەوە هـەر کەلوپـەل و کەرەسـتەیەکی تەکنۆلۆجیا و سیستەمەکانی پەیوەندی کردن بێت.

دووەم - خزمەتی ئالا بە یاسا ڕێك دەخرێت.

**ماددەی ( 10 )**

شوێنە پیرۆزەکان ومەزارگە ئاینییەکان لە عێراق قەوارەی ئاینی و شارستانین و دەوڵەت پابەندە بەرێز گرتن و پاراستنیان و مسۆگەر کردنی ئەنجام دانی دروشمەکان (شعائرەکان) بە ئازادی تیایاندا.

**ماددەی ( 11 )**

بەغداد پایتەختی کۆماری عێراقە.

**ماددەی ( 12 )**

یەکەم ـ ئالآی عێراق و دروشم و سرودی نیشتمانی بە یاسا ڕێك دەخرێت بە جۆرێك ئاماژە بە پێکهاتەکانی گەلی عێراق بکات .

دووەم ـ نیشانە و پشووی فەرمی و بۆنە ئاینی و نیشتمانیەکان و ڕۆژژمێری کۆچی و زایینی بە یاسا ڕێك دەخرێت.

**ماددەی ( 13 )**

یەکەم ـ ئەم دەستورە بە پایەدارترین و بالآترین یاسا دەژمێردرێت لەسەر تاسەری عیراقدا هەمووان پێ ی پابەندن بێ بە بەدەربوون (استثناء).

دووەم ـ نابێت یاسایەك دابنرێت، لەگەڵ ئەم دەستورە دا ناکۆك بێت و هەر دەقێکیش لە دەستوری هەرێمەکاندا یان هەر دەقێکی دیکەی یاسایی لەگەڵی دا ناکۆك بێت بە پوچەڵ دەژمێردرێت.

# بەشی دووەم
# ماف و ئازادیەکان
## بەندی یەکەم
## مافەکان
## یەکەم: مافە مەدەنی و سیاسی یەکان

**ماددەی** ( 14 )

عێراقیەکان لەبەردەم یاسادا یەکسانن بەبێ جیا کاری بەهۆی رەگەز یان نەژاد یان نەتەوە یان رەسەن یان رەنگ یان ئاین یان ئاینزا یان باوەڕی یان بۆچوون یان باری ئابووری یان کۆمەلآیەتییەوە.

**ماددەی** ( 15 )

هەر تاکێك مافی ژیان و ئاسایش و ئازادی هەیە و نابێت لەم مافانەدا بێ بەش بکرێت یان کۆتبەند بکرێت مەگەر بەپێ ی یاساو دەبێ لەسەر بڕیارێکی دەرچووی لایەنێکی دادوەریی تایبەتمەند بێت.

**ماددەی** ( 16 )

هەلی وەك یەك (تكافوء الفرص) مافێکی دەستەبەر کراوە بۆ گشت عێراقیەکان و دەوڵەتیش ڕێکارەکانی پێویست دەستبەردەکات بۆ بەدیهێنانی.

**ماددەی** ( 17 )

یەکەم ـ هەر تاکێك مافی تایبەتمەندێتی کەسایەتی هەیە بە جۆرێك لەگەڵ مافی کەسانی دیکەو ئادابی گشتی دا دژ نەبێت.

دووەم - ڕێز وپیرۆزی خانوو (مسکن) پارێزراوە، چونەژوورەوەی یان پشکنینی یان پەلاماردانی نابێت بە بێ بڕیارێکی دادوەریی و بە پێی یاسا نەبێت.

**ماددەی** ( 18 )

یەکەم - عێراقی هەر کەسێکە لە باوکێکی یان لە دایکێکی عێراقی لە دایك بوو بێت.

دووەم - ڕەگەزنامەی عێراقی مافی هەر عێراقییەکە و بنەمای هاولاتیبوونیەتی.

سێ یەم -

أ- ڕێگە بەلێسەندنەوەی (اسقاط) ڕەگەزنامەی عێراقی نادرێت کە بە لە دایکبووی عێراقی دراوە جا لەبەر هەر هۆیەك لە هۆیەکان بێت، و ئەوەی لیێ سەندراوەتەوە مافی خۆیەتی داوای گەرانەوەی بکات وئەویش بە یاسا ڕێك دەخرێت.

ب-ڕەگەزنامەی عێراقی دەستێندرێتەوە لەوەی بەرەگەزنامە بۆتە عێراقی لەو حالەتانەدا کە دەقی یاسایی دیاری دەکات.

چوارەم - عێراقی بۆی هەیە چەندین ڕەگەزنامەی هەبێت و ئەوەی پلە و پایەیەکی سەروەریی یان ئاسایشی بالا وەرگرێت دەبێت واز لە هەر ڕەگەزنامەیەکی دیکەی وەدەست هێنراو بهێنێت و ئەویش بە یاسا ڕێك دەخرێت.

پێنجەم - ڕەگەزنامەی عێراقی نادرێت بە مەبەستی سیاسەتی نیشتەجێ کردن کە دەبێتە هۆی تێکدانی پێکهاتەی دیموگرافی لە عێراق دا.

شەشەم - حوکمەکانی ڕەگەز نامە بە یاسا ڕێك دەخرێت و ئەو داوایانەی لێیەوە سەر هەڵدەدەن لە لایەن دادگا تایبەتمەندەکانەوە دەبینرێن.

**ماددەی ( 19 )**

یەکەم ـ دادەوریی سەربەخۆیە و هیچ دەسەلاتێك لەسەروویەوە نیە جگە لە یاسا.

دووەم ـ نە تاوان هەیە و نە سزا مەگەر بە دەق نەبێت وهیچ سزایەك نیە تەنها لە سەر ئەو کردەوە نەبێت کە یاسا بەتاوانی دادەنێت لەکاتی ئەنجام دانیەوە ونابێت سزایەك پیادە بکرێت توندتر بێت لەو سزایەی لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا جێبەجیێ کراوە.

سێیەم ـ دادگەرایی (التقاضي) مافێکی پارێزراو و دەستەبەرە بۆ هەمووان.

چوارەم ـ مافی داکۆکی کردن پیرۆزە ولەهەموو قوناغەکانی لێکۆڵینەوە و دادگاییکردندا دەستەبەرە.

پێنجەم ـ تۆمەتبار بێ تاوانە تاوەکو تاوانەکەی بەسەردا نەسەپێت لە دادگاییکردنێکی یاسایی و داد پەروەرانەدا وتۆمەتباریش بەهەمان تۆمەت جارێکی دیکە دادگایی ناکرێتەوە دوای ئازادکردنی، مەگەر بەڵگەی نوێی دیکە دەرکەون.

شەشەم ـ هەر تاکێك مافی هەیە کە دادپەروەرانە مامەڵە بکرێت لە رێکارەکانی دادوەریی و کارگێرییدا.

حەوتەم ـ دانیشتنەکانی دادگاکان بە ئاشکرایە مەگەر دادگا بریار بدات بکرێتە نهێنی.

هەشت ـ سزادان کەسی یە.

نۆیەم ـ یاسا کاریگەریی گەڕاوەی (أثر رجعي) نیە مەگەر دەقی پێچەوانەی هەبێت و ئەم بەدەربوونە یاسای باج و رە سمەکان ناگرێتەوە.

دەیەم ـ یاسای سزادان کاریگەریی گەڕاوەی نابێت مەگەر زیاتر لە بەرژەوندی تۆمەتبار دا بێت.

یازدەم ـ دادگا پارێزەرێك دەستنیشان دەکات بۆ داکۆکی کردن لەوەی بە تاوانکاری یان کەتن تۆمەتبارەو پارێزەرێکی نەبێت داکۆکی لیّ بکات، ئەویش لەسەر خەرجی دەوڵەتە.

دوازدەیەم ـ

أ- ڕێگە بە دەست بە سەرکردن نادرێت.

ب- بەندکردن یان دەستگیرکردن نابێت جگە لەو شوێنانەی بۆ

- ئەو مەبەستە تەرخان کراون بە پیّی یاساکانی بەندیخانە کە چاوەدێری تەندروستی وکۆمەلاّیەتی دەیانگرێتەوە و لەژێر بە دەسەلاّتەکانی دەوڵەتن.

سێزدەم ـ پەڕاوەکانی لێکۆڵینەوەی سەرەتایی دەبیّ لە ماوەی بیست و چوار کات ژمێردا لە دەست گیر کردنی تۆمەتبارەوە بخرێتە بەردەم دادوەری تایبەتمەندەوە و ناکرێت ماوەکە زیاتر لە جارێك درێژبکرێتەوە ئەویش بۆ هەمان ماوە.

**ماددەی ( 20 )**

هاولاّتیان پیاوان و ژنان مافی بەشداربوونیان هەیە لە کارو باری گشتی دا، هەروەها سوودمەندبوون لە مافە رامیارییەکان بە مافی دەنگدان و هەڵبژاردن و خۆ پالاّوتنیشەوە.

**ماددەی ( 21 )**

یەکەم ـ ڕێگە نادرێت عێراقی بدرێتە دەست لایەن و دەسەلاّتەکانی بێگانە.

دووەم ـ مافی پەنابەریی سیاسی لە عێراق بەیاسا ڕێك دەخرێت ونابێت پەنابەری سیاسی بدرێتە دەست لایەنێکی بیانی یان بەزۆر بگەڕێنرێتەوە ئەو ولاّتەی کە لێوەی هەلاّتووە.

سیٌیەم ـ مافی پەنابەریی سیاسی نادرێت بە تۆمەتبارێك بە ئـەنجام
دانی تاوانی نێودەوڵەتی یان تیرۆرستی تۆمەتبارێت یـان هـەر
یەكێك زیانی بە عێراق گەیاندبێت.

**دووەم:- مافە ئابووریی وكۆمەڵایەتییو فەرهەنگییەكان**

**ماددەی ( 22 )**

یەكەم ـ كاركردن مافی هەر هەموو عێراقییێكە بەجۆرێك ژیـانێكی
سەرفرازییان بۆ مسۆگەر بكات.

دووەم ـ یاسا پەیوەندیی نێوان كرێكار و خاوەنانی كارەكـان لەسـەر
بنەماگـەلی ئـابووری رێـك دەخـات، وێـرای رەچـاو كردنـی
بنەماكانی دادپەروەریی كۆمەڵایەتیی.

سـێیەم ـ دەوڵـەت مـافی پێكهێنـانی سـەندیكا و یەكێتییـە
پیشەییەكان یان چوونە ریزیانەوە دەستەبەر دەكات ئەویش بە
یاسا رێك دەخرێت.

**ماددەی ( 23 )**

یەكەم ـ موڵكایـەتی تایبـەت پـارێزراوە و خاوەنـدار مـافی سـود لیٌ
وەرگرتن و بەكار هێنان و بەرێوە بردنی هەیە لە سنوری یاسادا.

دووەم ـ نابێت موڵكایـەتی بسـەندرێت مەگـەر بـۆ مەبسـتی سـودی
گشتی و بەرامبەر بە قەرەبوویەكی داد پەروەرانە بێت و ئەویش
بە یاسا رێك دەخرێت.

سیٌ یەم ـ

أ- عێراقی مافی ئـەوەی هەیـە لەهـەر شـوێنێكی عێـراق دا
موڵكداربێت، و بۆ كەسێكی بیانی نابێت موڵكداری كردنی
نە گوازراوەكان بكات جگە لەوانەی بە یاسا بەدەر كراون.

ب- رێگـە بـە موڵكـداری نادرێـت بـە مەبەسـتی گـۆرینی
دیموگرافی.

**ماددەی ( 24 )**

دەوڵەت ئازادی گواستنەوەی کارگەر (الايدي العاملة) و شتومەك و سەرمایەکانی عێراقی لە نێوان هەرێمەکان و پارێزگاکان دەستە بەر دەکات و ئەویش بە یاسا رێك دەخرێت .

**ماددەی ( 25 )**

دەوڵەت چاکسازیی ئابوریی عێراقی بە پیێ بنەما مۆدێرنەکانی ئابووریی مۆدێرن دەستەبەر دەکات بە جۆرێك .کەوەبەرهێنانی تەواوی سامانەکەی و هەمەجۆریی سەرچاوەکانی هاندان و گەشەپێدانی کەرتی تایبەت مسۆگەر بکات.

**ماددەی ( 26 )**

دەوڵەت هاندانی وەبەر هێنانەکان لە کەرتە جۆراوجۆرەکاندا دەستە بەر دەکات و ئەویش بە یاسا رێك دەخرێت.

**ماددەی ( 27 )**

یەکەم ـ ماڵ وموڵکی گشتی حورمەتی خۆی هەیە و پاراستنی ئەرکێکە لەسەر شانی هەر هاوڵاتییەك .

دووەم ـ حوکمی تایبەت بە پاراستنی موڵکەکانی دەوڵەت و بەرێوەبردن و مەرجەکانی کارپێکردنییان و ئەو سنورەی کە نابێت تەنازول لە شتێکی ئەم موڵکانە و بکرێت بە یاسا رێك دەخرێت.

**ماددەی ( 28 )**

یەکەم ـ باج و رسومات ناسەپێندرێت و هەموار ناکرێت و ناسەندرێت و لیێ نا بەخشرێت تەنها بە یاسا نەبێت .

دووەم ـ خاوەن دەرامەتە نزمەکان لە باجدان دەبەخشرێن بەجۆرێك کە زیان بە کەمترین ڕادەی پێویست بۆ بژێویی نەگەینێت و ئەویش بە یاسا رێك دەخرێت.

**ماددەی (29)**

یەکەم ـ

أ- خێزان بنەمای کۆمەڵەو دەوڵەتیش پارێزگاری لە قەوارەکەی و بەها ئاینی و ئەخلاقی و نیشتمانیەکانی دەکات.

ب- دەولّەت پاراستنی دایکایەتی و زارۆکی و پیریّتی دەستەبەر دەکات و چاو دێری پیّگەییوان و گەنجان دەکات و هەموو بارۆدۆخێکی گونجا و بۆ گەشەسەندنی بەهرەو تواناکانیان فەراهەم دەکات.

دووەم ـ منداڵان مافیان بەسەر دایك و باوکانیانەوە هەیە لە پەروەردە و چاودێریی و فێرکردنیان و دایك باوکانیش مافیان بەسەر منداڵەکانیانەوە هەیە لە بەرێز گرتن و چاودێریان نەخاسمە لە حاڵەتەکانی دەست کورتی و پەك کەوتن و پیرییدا.

سێ یەم ـ رێگە بە چەو ساندنەوەی ئابووریيانەی زارۆکان نادرێت بەهەموو شێوەکانیەوە و دەولّەتیش رێوشوێنی دەستەبەر کراو دەگرێتە بەر بۆ پارستنیان.

چوارەم ـ هەموو شێوازەکانی توند و تیژی رەمەکی لە خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگادا قەدەغە کراوە.

**ماددەی (30)**

یەکەم ـ دەولّەت، بیمەی کۆمەڵایەتی (الضمان الاجتماعي) و تەندروستی، هەروەها پێگە بنەرتیەکانی ژیانێکی ئازاد و سەرفراز کە دەرامەت و خانووێکی (مسکن) گونجاو بۆ تاك و بۆ خێزان بەتایبەتی بۆ زارۆك و ژنان دابین و دەستەبەر دەکات.

دووەم ـ دەوڵەت بیمەی کۆمەڵایەتی و تەندروستی بۆ عێراقیەکان دەستە بەر دەکات لەحاڵەتی پیریی یان نەخۆشی یان پەك کەوتن لە کاردا یان دەربەدەر یان بیٚ نەوایی یان بیٚ کاری و کاریش دەکات بۆ پاراستنیان لە نەخوێندەواری وترس ونەداری وخانویان بۆ دابین دەکات وبەرنامەی تایبەت بۆ پیٚگەیاندن ویایەخ پێدانیان فەراهەم دەکات ئەویش بە یاساڕێك دەخرێت.

**ماددەی (31)**

یەکەم ـ هەموو عێراقیەك مافی چاودێریی تەندروستی هەیەو دەوڵەت بایەخ بە تەندروستی گشتی دەدات و شێوازەکانی خۆ پاراستن و چارەسەر کردن بە بنیاتنانی جۆرەها نەخۆشخانە و دامەزراوەی تەنددروستی دەستەبەر دەکات.

دووەم ـ دەستە و تاکەکان بۆیان هەیە نەخۆشخانە یان بنکەی تەندروستی یان خانوی چارەسەر کردنی تایبەت بە سەرپەرشتی دەوڵەت بینا بکەن ئەویش بە یاسا ڕێك دەخرێت.

**ماددەی (32)**

دەوڵەت چاودێریی کەمئەندامان وخاوەن پێداویستییە تایبەتەکان دەکات و پێگەیاندنیان دەستەبەر دەکات بە مەبەستی تێکەڵاوکردنەوەیانەوە بە کۆمەڵەوە ئەویش بە یاسا ڕێك دەخرێت.

**ماددەی (33)**

یەکەم ـ هەموو کەسێك مافی ژیانی هەیە لە بارودۆخی ژینگەیەکی سەلامەتدا.

دووەم ـ دەوڵەت پاراستنی ژینگەو هەمەجۆریی زیندەواری و پاراستنیان دەستەبەر دەکات.

**ماددەی ( 34 )**

یەکەم ـ فێرکردن هۆکارێکی بنەرەتی بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگەیە و مافێکە دەوڵەت دەستەبەری دەکات و لە قۆناغی سەرەتایی دا تەوزیمی یە و دەوڵەت قەلاّچۆکردنی نەخوێندەواری دەستە بەردەکات.

دووەم ـ فێرکردن بە خۆڕایی مافی هەموو عێراقییەکانە لەهەموو قۆناغەکاندا.

سێیەم ـ دەوڵەت هانی توێژینەوەی زانستی دەدات بۆ مەبەستی ئاشتیانە و خزمەت کردنی مرۆڤایەتی و چاودێریی سەرکەوتن و داهێنان و دۆزینەوە و نیشانە جیاکانی بلیمەتی دەکات.

چوارەم ـ فێرکردنی تایبەت و ئەهلی دەستە بەرە و بە یاسا ڕێک دەخرێت.

## بەندی دووەم: ئازادییەکان

**ماددەی ( 35 )**

یەکەم ـ

أ- ئازادی و ئابڕومەندی مرۆڤ پارێزراوە.

ب- نابێ کەس بە بێ بڕیارێکی دادوەریی دەستگیر بکرێت یان لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دا بکرێت.

ج- هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەکی دەروونی و جەستەیی و هەڵسوکەوتی نامرۆڤانە قەدەغەیە و هیچ دانپیانانێک بایەخی نیە کە بە زۆریی و هەڕەشە و ئەشکەنجە سەندرابێت، زیان لێ کەوتووش بۆی هەیە داوای قەرەبووی ئەو زیانە ماددی و مەعنەوی یانە بکاتەوە کە لێ کەوتوون، بە پێی یاسا.

دووەم ـ دەوڵەت پاراستنی تاك دەستەبەر دەكات لە زۆر لێكردنی فیكری و سیاسی و ئاینی.

سێ یەم ـ كاری بێگاریی (سوخرە) و كۆیلەیی و بازرگانیی كۆیلە و بازرگانیی بە ژن و منداڵ و بازرگانیكردن بە (سێكس) قەدەغەیە.

**ماددەی** ( 36 )

دەوڵەت ئەوانەی خوارەوە دەستەبەر دەكات بە شێوەیەك كە پێچەوانەی سیستەم و ئادابی گشتی نەبێت:

یەكەم ـ ئازادیی ڕادەربڕین بەهەموو ڕێگەو شێوازێك.

دووەم ـ ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چاپكردن و ئاگاداركردنەوە بۆ ڕاگەیاندن و بڵاوكردنەوە.

سێ یەم ـ ئازادیی كۆبوونەوەو خۆ پێشاندانی ئاشتیانە بەپێی یاسا ڕێك دەخرێت.

**ماددەی** ( 37 )

یەكەم ـ ئازادیی دامەزراندنی كۆمەڵە و پارتە سیاسییەكان، یان ئەندام بوون تیایاندا دەستەبەركراوە و ئەوەش بە یاسا ڕێك دەخرێت.

دووەم ـ نابێ هیچ كەس ناچار بكرێت بۆ چوونە ناو هیچ پارتێك یان كۆمەڵەیەك یا لایەنێكی سیاسی، یان ناچار كردنی بۆ بەردەوام بوون لە ئەندامێتی تیایدا.

**ماددەی** ( 38 )

ئازادیی گەیاندن و نامە نێردراوەكانی پۆستەیی و بروسكەیی و تەلەفۆنی و ئەلیكترۆنی و ئەوانی دی دەستەبەركراوە، نابێ چاودێری بكرێت، یان هەستی لێ ڕابگیرێت، یان ئاشكرا بكرێت،

تەنها لەبەر پێویستییەکی یاسایی وئاسایشی نەبێت و ئەویش بە بڕیارێکی دادوەریی بێت.

**ماددەی ( 39 )**

عێراقیەکان ئازادن لە پابەندبوونییان بۆ کاروباری کەسایەتییان بەپێی ئایینەکانیان یان ئاینزاکانیان یان بیروباوەڕەکانیان یان ویستەکانی خۆیان و ئەویش بە یاسا ڕێکدەخرێت.

**ماددەی ( 40 )**

هەموو کەسێك ئازادیی بیرو ویژدان و باوەڕی هەیە.

**ماددەی ( 41 )**

یەکەم ـ شوێنکەوتووانی گشت ئایینێك یان ئاینزایەك ئازادن لە:

أ- ئەنجامدانی دابە ئاینییەکانیان بە دابەکانی حوسەینیشەوە.

ب- بەڕێوەبردنی ئەوقاف و کاروباری ئەوقاف و دام و دەزگا ئایینیەکانی و ئەویش بە یاسا ڕێکدەخرێت.

دووەم ـ دەوڵەت ئازادی پەرستن و پاراستنی شوێنەکانی دەستەبەر دەکات.

**ماددەی ( 42 )**

یەکەم ـ عێراقی ئازادیی گواستنەوە و گەشت و نیشتەجێ بوونی هەیە لە ناوەوەی عێراق و دەرەوەیدا.

دووەم ـ عێراقی نابێت نەفی بکرێ، یان دووربخرێتەوە، یان بێبەش بکرێت لە گەڕانەوەی بۆ نیشتمان.

**ماددەی ( 43 )**

یەکەم ـ دەوڵەت بە پەرۆشەوە هەوڵی کاراکردنی ڕۆڵی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و پشتیوانی لێکردن و پێشخستن وسەربەخۆییان دەدات بەجۆرێك لەگەڵ شێوازە

ئاشتیخوازەکاندا بۆ بەدیهێنانی ئامانجە رەواکانیان بگونجێت ئەویش بە یاسا رێکدەخرێت.

دووەم ـ دەوڵەت بە پەرۆش دەبێت لەسەر بەرز کردنەوەی ئاستی خێڵ و هۆزە عێراقیەکان و گرنگیدان بە کاروباریان بە شێوەیەك کە لەگەڵ ئایین و یاسادا گونجاو بێت وە بەها مرۆڤایەتییە بالاکان پتەو بکات و بەشداریش بێت لە بەرەو پێش بردنی کۆمەڵگەدا و رێگەش بەو نەریتە خێڵەکییانە نادات کە لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدا ناگونجێن.

**ماددەی ( 44 )**

ناکرێت هیچ کام لەو ماف و ئازادییانەی لەم دەستوورەدا هاتوون کۆتبەند یان سنووردار بکرێت تەنها بە یاسا یان پشت بەستن بە یاسا نەبێت، بە مەرجێ ئەم سنووردار کردن و کۆتبەندیە زیان بە کرۆکی ماف یان ئازادی یەکان نەگەیەنێت.

# بەشی سێ یەم
# دەسەلاتە فیدراڵەکان

**ماددەی ( 45 )**

دەسەلاتەکانی فیدرالی لە دەسەلاتی یاسا دانان و جێبەجێکردن و دادوەریی پێکدێت ، تایبەتمەندی و ئەرکەکانی خۆیان لەسەر بنەمای پرەنسیپی لێك جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان پیادە دەکەن.

## بەندی یەکەم
## دەسەلاتی یاسا دانان

**ماددەی ( 46 )**

دەسەلاتی یاسا دانانی فیدرالی لە ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی فیدراڵ پێك دێت.

یەکەم : ئەنجومەنی نوێنەران

**ماددەی ( 47 )**

یەکەم ـ ئەنجومەنی نوێنەران لە ژمارەیەك ئەندام بەرێژەی یەك کورسی بۆ هەر سەد هەزار کەس لە خەڵکی عێراق کە نوێنەرایەتی سەرجەم خەڵکی عێراق دەکەن پێکدێت، بەرێگای دەنگدانی گشتی نهێنی راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن ونوێنەرایەتی گشت پێکهاتەکانی گەلی تیادا رەچاو دەکرێت .

دووەم ـ مەرجە پاڵێوراو بۆ ئەندامیەتی ئەنجومەنی نوێنەران عێراقی بێت و شایستەیی تەواوی هەبێت .

سێ یەم ـ مەرجەکانی پاڵێوراو و دەنگدەر و هەرچی پەیوەندی هەیە بە هەڵبژاردنەوە بە پێ ی یاسا رێك دەخرێت .

چوارەم ـ یاسای هەڵبژاردنەکان هەوڵی دابین کردنی رێژەیەکی نوێنەرایەتی بۆ ئافرەتان دەدات کە لە چواریەکی ئەندامانی ئەنجومەن کەمتر نەبێت .

پێنجەم ـ ئەنجومەنی نوێنەران یاسایەك دەردەکات حاڵەتەکانی گۆرینی ئەندامەکانی لە کاتی دەست لەکار کێشانەوەیان لادان یان مردن چارەسەر بکات .

شەشەم ـ نابێت ئەندامێتی ئەنجومەنی نوێنەران لەگەڵ هیچ کارو پۆستێکی دیکەی فەرمی کۆ بکرێتەوە .

**ماددەی ( 48 )**

ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران سوێندی دەستووریی دەخوات لە بەردەم ئەنجومەن دا پێش دەست بەکار بوونی بەم شێوەیەی خوارەوە :

(سوێند بە خوای بەرز و مەزن دەخۆم کەوا ئەرك و کارە یاسایی یەکانم بە خۆنەویستی و دڵسۆزیی راپەرێنم و پارێزگاری لە سەروەریی و سەر بە خۆیی عێراق بکەم و خزمەتی بەرژەوەندیەکانی گەلەکەی بکەم و شەو نخونی بکەم بۆ سەلامەتی

زەوی و ئـا سمــان و ئــاوو ســامان و سیســتەمە دیــوکراتی و فیدرالەکەی و کار بۆ پاراستنی ئازادییە گشتی و تایبەتی یەکان و سەر بە خۆیی دادوەریی بکەم و پابەندی بەجێگەیانـدنی یاسـاکان بم بە دەست پاکی و بێ لایەنی و خودا شاهیدە لەسەر قسەکانم )

**ماددەی** ( 49 )

ئەنجومـەنی نوێنـەران پـەیڕەوێکی نـاوەخۆ بۆخـۆی دادەنێـت بـۆ ڕێکخستنی بەڕێوە چوونی کارەکانی.

**ماددەی** ( 50 )

یەکەم ـ ئەنجومەنی نوێنەران لە ماوەی سی ڕۆژدا لە مێژووی تۆمار کردنـی نـاڕەزایی لــە دروسـتی ئەنـدامێتی ئەندامــەکانی دەکۆڵێتەوە بە زۆرینەی دوو لەسەر سێ ی ئەندامەکانی .

دووەم ـ دەکرێ تانووت لە بریاری ئەنجوومەن بدرێ لە بەردەم دادگای فیدرالی بالآدا لەماوەی سی ڕۆژ لە مێژووی دەرچوونیەوە.

**ماددەی** ( 51 )

یەکەم ـ دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران بە ئاشکرا دەبن تـەنها ئەگەر لەبەر هەر پێویستییەك و بە پێچەوانەکەی بە پێویسـت بینرا .

دووەم ـ کۆ نووسی دانیشتنەکان بەو شـێوەیەی کـە ئەنجوومـەن بـە گونجاوی بزانێ بلاودەکرێنەوە .

**ماددەی** ( 52 )

سەرۆکی کۆمار بەرێوەرەسمێکی کۆماری داوادەکـات ئەنجوومـەنی نوێنەران کۆببێتەوە لەماوەی پازدە ڕۆژدا لە ڕۆژی پەسەند کردنـی ئەنجامی هەڵبژاردنـە گشـتیەکانەوە و کۆبوونەوەکـەش لـە لایـەن بەتـەمەنترین ئەندامــەوە ســەرۆکایەتی دەکرێـت بـۆ هەڵبـژاردنی سەرۆکی ئەنجومەن و دوو جێگرەکەی و ناشکرێت لەو ماوەیەی کە لە پێشەوە نوسراوە درێژتر بکرێتەوە.

**ماددەی ( 53 )**

ئەنجوومەنی نوێنەران لە یەکەم کۆبوونەوەی دا سەرۆکێك ، پاشان جێگری یەکەم و جێگری دووەم بۆخۆی هەڵدەبژێرێت ئەویش بە دەنگدانی نهێنی راستەوخۆ و بە زۆرینەی رەهای ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەن .

**ماددەی ( 54 )**

یەکەم ـ ماوەی خولی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران چوار ساڵی تەواو دەبێت بەپێ ی رۆژمێری زایینی لە ، یەکەم دانیشتنی دەست پێدەکات و لە کۆتایی ساڵی چوارەم دا تەواو دەبێت .

دووەم ـ ئەنجوومەنی نوینەرانی نویٚ بەر لە چل و پێنج رۆژ لە مێژووی بە کۆتاهاتنی خولی هەڵبژاردنییەوە هەڵدەبژیردرێت.

**ماددەی ( 55 )**

ئەنجوومەنی نوێنەران یەك خولی کۆبوونەوەی ساڵانەی هەیە بەدوو وەرزی یاسا دانان کەماوەی هەردووکیان هەشت مانگە، پەیڕەوی ناوخۆ چۆنیەتی گرێدانیان دیاری دەکات و ئەو وەرزەی کە بوودجەی گشتی تیا دا دەخرێتە ڕوو تەواو نابێت تا وەکو بوودجەکە پەسەند نەکرێت .

**ماددەی ( 56 )**

یەکەم ـ سەرۆك کۆمار یان سەرۆکی وەزیران یان سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران یان پەنجا ئەندام لە ئەندامانی ئەنجومەن بۆیان هەیە داوای دانیشتنی نائاسایی بکەن ، کۆبوونەوەکەش سنووردار دەبێت لەو بابەتانەی کە پێویستی کردووە بانگەوازی دانیشتنەکەی بۆ بکرێت .

دووەم ـ وەرزی یاسا دانانی خولی کۆبونەوەی ئەنجومەنی نوێنەران درێژ دەکرێتەوە بۆ ماوەیەك کە لە سی ڕۆژ زیاتر نەبێت ، بۆ

تــەواو كردنــی ئــەو ئەركانــەی وا دەخــوازن ، لەســەر داوای سەرۆكی كۆمار یان سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران یان سەرۆكی ئەنجوومــەنی نوێنــەران یــان پــەنجا ئەنــدام لــە ئەنــدامانی ئەنجوومەن .

**ماددەی ( 57 )**

یەكەم ـ

أ- ڕێژەی یاسایی گرێدانی دانیشــتنەكانی ئەنجومــەنی نوێنــەران تــەواو دەبێــت بــە ئامــادەبوونی زۆرینــەی ڕەهــای ژمــارەی ئەندامەكانی.

ب-بریارەكان لە كۆبوونەوەكانی ئەنجوومەنی نوێنەران بەزۆرینــەی سادە وەردەگیرێن دوای بەدەستهاتنی ڕێــژەی یاســایی ئەگــەر دەقێكی پێچەوانە نەبوو.

دووەم ـ

أ- پرۆژەی یاساكان لە لایەن سەرۆك كۆمار و ئەنجومەنی وەزیران پێشكەش دەكرێت .

ب- پێشــنیاری یاســاكان لــە لایــەن دە كــەس لــە ئەنــدامانی ئەنجوومەنی نوێنەران یان یەكێ لە لیژنــە پەیوەندارییەكانیــەوە پێشكەش دەكرێت .

**ماددەی ( 58 )**

ئەنجوومەنی نوێنەران ئەم دەسەلآتانەی هەیە:

یەكەم ـ دانانی یاسا فیدرالیەكان.

دووەم ـ چاودێریكردنی چۆنیەتی كاركردنی دەسەلآتی جێبەجێكردن.

سێ یەم ـ بە پێ ی یاسایەك كــرداری پەســەند كردنــی پەیماننامــەو ڕێكەوتنە نێو دەوڵەتییەكان، ڕێك دەخرێت بە زۆرینەی دوو لە سەر سێ ی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوینەران.

چوارەم ـ هەڵبژاردنی سەرۆك كۆمار.
پێنجەم ـ رەزامەندیی لەسەر دامەزراندنی هەر یەك لە :

أ- سەرۆك و ئەندامانی دادگای تەمییزی فیدرالی و سەرۆكی داواكاری گشتی و سەرۆكی دەستەی سەرپەرشتیاری دادوەریی بەزۆرینەی رەها ، لەسەر پێشنیاری ئەنجومەنی دادوەریی باڵا .
ب- بالیۆز و خاوەن پلە تایبەتەكان لەسەر پێشنیاری ئەنجومەنی وەزیران .
ج- سەرەك ئەركانی سوپا و یاریدەدەرانی و ئەوانەی لە پلەی فەرماندەی فیرقە و بەرەوژوور ، سەرۆكی دەزگای هەواڵگری لەسەر پێشنیاری ئەنجوومەنی وەزیران .

شەشەم ـ

أ- لێپرسینەوەی سەرۆك كۆمار لەسەر داواكارییەكی هۆدار بە زۆرینەی رەهای ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران.
ب- لەسەركارلادانی (اعفاء)سەرۆك كۆمار بەزۆرینەی رەهای ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران ، دوای تۆمەتبار كردنی لە لایەن دادگای باڵای فیدرالیەوە لەیەكێ لەم حاڵەتانەدا :

1- شكاندنی سوێندی دەستووری.
2- پێشێل كردنی دەستوور.
3- خیانەتی مەزن.

حەوتەم ـ

أ- ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بۆی هەیە پرسیار ئاراستە سەرۆكی ئەنجوومەنی وەزیران و وەزیرەكان بكات لە هە بابەتێك كە تایبەت بێت پێیانەوە و هەر یەك لەوانیش بۆیا

هەیە وەڵامی پرسیاری ئەندامان بداتــەوە، و تــەنها خــاوەن پرسیار مافی بەدواداچوونی وەڵامەکانی هەیە.

ب-بە لانی کەم بیست و پێنج ئەندام لە ئەندامانی ئەنجومــەنی نوێنەران بۆیان هەیە کــە بابــەتێکی گشــتی بخەنــە روو بــۆ گفتوگۆ بە مەبەستی روونکردنــەوەی سیاســەت و چــۆنیەتی کاری ئەنجوومــەنی وەزیــران یــان یــەکێ لــە وەزارەتــەکان و داوایەکە پێشکەشی سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران دەکرێت و سەرۆکی ئەنجوومــەنی وەزیــران یــان وەزیرەکــان وادەیــەك دیاری دەکەن بۆ ئامادەبوون لەبەردەم ئەنجوومەنی نوێنــەران بۆ گفتوگۆ کردن لەسەری.

ج- ئەندامی ئەنجوومــەنی نوێنــەران بــۆی هەیــە بەرەزامەنــدی بیســت و پێــنج ئەنــدام لێکۆڵینــەوە ئاراســتەی ســەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران یان وەزیرەکان بکات بۆ لێپرســینەوەیان لەو کارو بارانەی پەیوەندی بە ئەوانەوە هەیــە و گفتوگــۆش لەسەر لێکۆڵینەوەکە ناکرێت تا حــەوت ڕۆژ بەلایــەنی کــەم بەسەر پێشکەش کردنیەوە تیپەر نەکات .

هەشتەم -

أ- ئەنجوومەنی نوێنەران بۆی هەیە متمانە وەرگرێتەوە لەیەکێ لە وەزیرەکان بەزۆرینــەی رەهــا و بەدەســت لــەکار کێشــاوە دادەنرێت لە رۆژی بریاری متمانە لێ وەرگرتنــەوەی و نــابێ مەسەلەی متمانە بە وەزیر بخرێتە روو تەنها لەسەر ویســتی خۆی نەبێت یان داوایەك کە پەنجا ئەندام ئیمزای بکــات دوا بەدوای گفتوگۆ کردن لەسەر ئەو لێکۆڵینەوەیەی ئاراســتەی کراوە و ئەنجوومەنیش بریار لەسەر داوایەکە نادات تا حەوت

ڕۆژ تێپەڕ نەکات بەلانی کەم بەسەر مێژووی پێشکەشکردنییەوە .

ب-

1- سەرۆك کۆمار بۆی هەیە داخوازیەك پێشکەشی ئەنجوومەنی نوێنەران بکات بۆ متمانە وەرگرتنەوە لە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران .

2- ئەنجوومەنی نوێنەران لەسەر داخوازی پێنج یەکی (5/1) ئەندامەکانی بۆی هەیە متمانە وەربگرێتەوە لەسەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و نابێ ئەم داوایە پێشکەش بکرێت تا لێکۆڵینەوەیەك ئاراستەی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران نەکرێت لە دوای حەوت ڕۆژ لە مێژووی پێشکەش کردنی داخوازیەکە .

3- ئەنجوومەنی نوێنەران بەزۆرینەی ڕەهای ئەندامانی بۆی هەیە متمانە وەربگرێتەوە لە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران .

ج- ئەگەر متمانە لەسەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران وەرگیرایەوە، وەزارەت بە دەست لە کارکێشاوە دادەنرێت.

د- ئەگەر دەنگ درا بە متمانە وەرگرتنەوە لە ئەنجوومەنی وەزیران بەتێکڕایی ئەوا سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و وەزیرەکان بەردەوام دەبن لە پۆستەکانیان دا بۆ بەڕێوبردنی کاری ڕۆژانە بۆ ماوەیەك کە لە سی ڕۆژ زیاتر نەبێت ، تا ئەو کاتەی ئەنجوومەنی تازەی وەزیران پێکدێت بە پێ ی حوکمەکانی ماددەی (74) لەم دەستوورە دا .

هـ- ئەنجوومەنی نوێنەران مافی لێکۆڵینەوەی لە بەرپرسانی ئۆرگانە سەر بەخۆکان هەیە بە پێ ی هەمان ڕێ و شوێنی

تایبەت بە وەزیرەکان و مافی لەسەرکارلادانییان (اعفاء) هەیە بەزۆرینەی رەها.

نۆ یەم -

أ- رەزامەندی لەسەر راگەیاندنی جەنگ و باری نائاسیی بەزۆرینەی دوو لەسەر سێ ، لەسەر داخوازییەکی هاوبەشی سەرۆك کۆمارو سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران .

ب-باری نا ئاسایی بۆ ماوەی سی رۆژ رادەگەیەنرێ کە دەکرێ درێژ بکرێتەوە بەرەزامەندی لەسەر دان بۆ هەر جارێك.

ج- سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران دەسەلاتی پێویستی پێ دەدرێت کە بتوانێ کارو باری وولات بەرێوەبەرێت لە ماوەی راگەیاندنی جەنگ و باری نائاسایی وبە پێ ی یاسا ئەم دەسەلاتانە رێکدەخرێت بەجۆرێك لەگەڵ ئەم دەستوورە ناکۆك نەبێت.

د- سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران رێکارە (الاجراءات) ئەنجامدراوەکان و سەرەنجامەکانی دەخاتە رووی ئەنجوومەنی نوێنەران لەماوەی راگەیاندنی جەنگ و باری نا ئاسایی و لەماوەی پازدە رۆژ لەکۆتایی هاتنی دا.

**ماددەی (59)**

یەکەم - ئەنجوومەنی وەزیران پرۆژەی یاسای بودجەی گشتی و ژماردنی کۆتایی پێشکەشی ئەنجوومەنی نوێنەران دەکات بۆ پەسەند کردنی .

دووەم - ئەنجوومەنی نوێنەران بۆی هەیە راگواستنەوە (مناقلة) بکات لە نێوان بەش و بەندەکانی بوودجەی گشتی دا و داشکاندنی سەرجەم گوژمەکانی و بۆی هەیە لەکاتی پێویست دا پێشنیاز

بکات بۆ ئەنجوومەنی وەزیران کە بڕی تێچووی خەرجییەکان زیاد بکات .

**ماددەی** ( 60 )

یەکەم ـ ماف و ئیمتیازەکانی سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و هەردوو جێگر و ئەندامانی ئەنجوومەن بەپێی یاسا دیاری دەکرێت.

دووەم ـ

أ- ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران (حصانة)ی هەیە لەسەر ئەو بیر و ڕایانەی کە دەریان دەبڕێت لەماوەی خولی گرێدان دا و نابێ ڕووبەڕوی دادگاکان بکرێتەوە لەم ڕووەوە.

ب-نابێت ئەندامی ئەنجوومەن دەستگیر بکرێ لە ماوەی وەرزی یاسایی دا مەگەر تۆمەتبار کرا بێت بە تاوان و بە ڕەزامەندی زۆرینەی ڕەهای ئەندامان (حصانة)ی لەسەر هەڵبگیرێت یانیش ئەگەر لەکاتی ئەنجامدانی تاوانێکی بینراو دا دەستگیرکرا بێت .

**ماددەی** ( 61 )

یەکەم ـ ئەنجوومەنی نوێنەران هەڵدەوەشێتەوە بەزۆرینەی ڕەهای ئەندامانی ، لەسەر داوای سێ یەکی ئەندامانی ، یان داوای سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و ڕەزامەندیی سەرۆك كۆمار، بەڵام ئەنجوومەن نابێ هەڵبوەشێنرێتەوە لەکاتی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران دا.

دووەم ـ سەرۆك کۆمار لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران دا بانگهێشت دەکات بۆ هەڵبژاردنی گشتی لە وولاّت لەماوەیەك کە لە شەست ڕۆژ تێپەر نەکات لە مێژووی

هەڵوەشاندنەوەکە، لەو حالەتەش دا ئەنجوومەنی وەزیران بە دەست لە کار کێشاوە دادەنرێ بەڵام بەردەوام دەبێت بۆ بەڕێوە بردنی کاری ڕۆژانە .

## دووەم : ئەنجوومەنی فیدراڵی

**ماددەی** ( 62 )

ئەنجوومەنێکی یاسا دانان دادەمزرێت بەناوی (ئەنجوومەنی فیدرالی) کە نوێنەرانی هەرێمەکان و ئەو پارێزگایانەی لەنێو هەرێمێك دا نین دەگرێتەوە، پێکهاتەی ئەنجوومەن و مەرجەکانی ئەندامێتی تیایداو دەسەڵاتەکانی و هەرچی پەیوەندی پێیەوە هەیە، یاسایەکی بۆ دادەنرێت بە زۆرینەی دوو لە سەر سێ ی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران.

## بەندی دووەم
## دەسەڵاتی جێبەجێکردن

**ماددەی** ( 63 )

دەسەڵاتی جێ بەجێ کردنی فیدرالی پێك دێت لە سەرۆك کۆمار و ئەنجوومەنی وەزیران ، کە دەسەڵاتەکانی بەپێ ی دەستوور و یاسا جێبەجێدەکات.

## یەکەم ــ سەرۆك کۆمار

**ماددەی** ( 64 )

سەرۆك کۆمار سەرۆکی دەوڵەت و هێمای یەکێتی نیشتمانە و نوێنەرایەتی سەروەری وولات دەکات و شەو نخونی دەکات بۆ مسۆگەر کردنی پابەندبوون بە دەستوور و پاراستنی سەر بە خۆیی عێراق و سەروەری و یەکێتی و سەلامەتی خاکەکەی بە پێ ی برگەکانی دەستوور.

**ماددەی ( 65 )**

مەرجەکانی پالێوراو بۆ سەرۆکایەتی کۆمار ئەمانەن:

یەکەم ـ لە عێراق لە دایك بوو بێت و دایك و باوکی عێراقی بن.

دووەم ـ شایستەیی تەواو بێت و چل سالّی لە تەمەنی تەواو کردبێت.

سێ یەم ـ ناوبانگی باش بێت و شارەزایی لە سیاسەت هەبێت و ناسراو بێت بە دەستپاکیی و راستڕێیی (الاستقامة) و دادگەری و دلّسۆزی بۆ نیشتمان.

چوارەم ـ حوکم نەدرا بێت بە تاوانێکی ئابڕووبەر.

**ماددەی ( 66 )**

حوکمەکانی پالاّوتن بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار بە یاسا رێك دەخرێت .

**ماددەی ( 67 )**

یەکەم ـ ئەنجوومەنی نوێنەران بە زۆرینەی دوو لەسەر سێ ی ئەندامانی و لەنێوان پالێوراوان دا سەرۆکێك بۆ کۆمار هەلّدەبژێرێت .

دووەم ـ ئەگەر هیچ کام لە پالێوراوان زۆرینەی پێویستیان بەدەست نەهێنا ئەوا کێ برکێ دەکرێت لە نێوان ئەو دوو پالێوراوەی زۆرترین دەنگیان بەدەست هێناوە ، ئەو کەسەی کە زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بێنێت لە دەنگدانی دووەم دا رادەگەیەندرێ بە سەرۆکی کۆمار.

**ماددەی ( 68 )**

سەرۆك كۆمار سوێندی دەستووری دەخوات لە بەردەم ئەنجوومەنی نوێنەراندا بە پیێ ی ئەو شێوازەی كە لە ماددەی (49)ی ئەم دەستوورە دا دەقنووس كراوە .

**ماددەی ( 69 )**

یەكەم - ماوەی سەرۆكایەتی سەرۆك كۆمار بە چوار ساڵ دیاریدەكرێت و دەشێت تەنها بۆیەك جاری دیكە هەڵببژێردرێتەوە.

دووەم -

أ- ماوەی سەرۆكایەتی سەرۆك كۆمار بە كۆتایی هاتنی ماوەی ئەنجومەنی نوێنەران كۆتایی دێت.

ب-سەرۆك كۆمار لەسەر ئەنجامی كارەكانی بەردەوام دەبێت هەتا پاش هەڵبژاردنی ئەنجومەنێكی نوێی نوێنەران و دەستبەكار بوونی.

ج- ئەگەر لەبەر هەرهۆیەك پایەی سەرۆك كۆمار چۆڵ بوو، دەبێ سەرۆكێكی تازە هەڵبژێردرێت ، بۆ تەواوكردنی ئەو ماوەیەی سەرۆكایەتی كۆمار كە ماوە.

**ماددەی ( 70 )**

سەرۆك كۆمار ئەم دەسەلاَتانەی هەیە:

یەكەم - دەرچوواندنی لێبوردنی تایبەت لەسەر راسپاردەی سەرۆكی ئەنجوومەنی وەزیران جگە لەوانەی كە پەیوەستن بەمافی

تایبەت یان ئەوانەی بە تاوانی نێو دەوڵـەتیی و تیرۆرسـتیی و گەندەڵیی دارایی و کارگێڕیی حوکم دراون .
دووەم ـ پەسەند کردنی پەیماننامە و ڕێککەوتنە نێو دەوڵەتییەکان ، دوای ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی نوێنەران و بە پەسەند دادنرێـت دوای تێپەر بوونی پازدە ڕۆژ لە مێژووی وەرگرتنیەوە .
سیٰ یەم ـ ئەو یاسایانەی کـە لـە لایـەن ئەنجوومـەنی نوێنەرانـەوە دادەنرێت ، پەسەند دەکات و دەردەچوێنیٰ بـە تێپـەر بـوونی پـازدە ڕۆژ بەسـەر ڕۆژی وەرگرتنـی بـۆ سـەرۆکایەتی بـە پەسەندکراو دەژمێردرێت.
چوارەم ـ بانگ هێشتکردنی ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ کۆبوونەوە لـە ماوەی پازدە ڕۆژ لـە مـێژووی پەسـەند کردنـی دەرەنجـامی هەڵبژاردنـەکان و لـە حاڵەتـەکانی دیکـە دا کـە لەدەسـتوور دەقنووس کراوە.
پێنجەم ـ بەخشینی مەدالیا و نیشانەکان بـە ڕاسـپاردەی سـەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران بە پیٰ ی یاسا .
شەشەم ـ قەبوڵکردنی باڵیۆزەکان.
حەوتەم ـ دەرچواندنی ڕێورەسمی (مراسیم)ی کۆماری.
هەشتەم ـ پەسەند کردنی حوکمی لە سێدارەدان کە لە لایـەن دادگـا تایبەتمەندەکانەوە دەردەچێت.
نۆیـەم ـ هەڵدەسـتێت بـە ئـەرکی سـەرکردایەتی بـالای هێـزە چەکدارەکان بۆ مەبەستی تەشریفاتی و ئاهەنگ گێڕان.
دەیەم ـ پیادە کردنی هەر دەسەلاتێکی دیکەی سـەرۆکایەتی کـەوا لەم دەستوورە دا هاتووە.

**ماددەی ( 71 )**

مووچە و دەرماڵەی سەرۆك کۆمار بە یاسا دەستنیشان دەکرێت.

**ماددەی** ( 72 )

یەکەم ـ سەرۆك كۆمار بۆی هەیە بەنووسراو دەست لەكار كێشانەوەی خۆی پێشكەش بكات بە سەرۆكی ئەنجوومەنی نوێنەران و دوای تێپەر بوونی حەوت ڕۆژ بەسەر سپاردنی بە ئەنجوومەنی نوێنەران بەكارپێكراو دەژمێردرێت.

دووەم ـ لەكاتی ئامادەنەبوونی سەرۆك كۆمار جێگرەكەی جێی دەگرێتەوە.

سێ یەم ـ لەكاتی چۆل بوونی پۆستی سەرۆك كۆمار بەهەر هۆیەك، جێگرەكەی جێگەی دەگرێتەوە و پێویستە ئەنجوومەنی نوێنەران لە ماوەیەك كە سی ڕۆژ لە ڕۆژی چۆل بوونیەوە تێپەرنەكات سەرۆكێكی نوێ هەڵبژێرێت.

چوارەم - لە كاتی چۆل بوونی پایەی سەرۆك كۆماردا، ئەگەر جێگری نەبوو، ئەوا سەرۆكی ئەنجومەنی نوێنەران جێی دەگرێتەوە بە مەرجێك لە ماوەی سێ ڕۆژ لە چۆلبوونییەوە سەرۆكێكی نوێ بە پێی حوكمەكانی ئەم دەستوورە هەڵدەبژێردرێت.

## دووەم: ئەنجوومەنی وەزیران

**ماددەی** ( 73 )

یەكەم ـ لە ماوەی پازدە ڕۆژ دوای یەكەم دانیشتنی ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە، سەرۆك كۆمار پاڵێوراوی گەورەترین فراكسیۆنی نوێنەران لە رووی ژمارەوە ڕادەسپێرێت بۆ پێكهێنانی ئەنجوومەنی وەزیران.

دووەم ـ سەرۆكی ئەنجوومەنی وەزیرانی راسپێردراو هەڵدەستێت بە ناوزەدكردنی ئەندامانی وەزارەتەكەی لە ماوەیەك كە سی ڕۆژ زیاتر نەبێت لە مێژووی راسپاردنییەوە.

سێیەم ـ لەکاتی شکست هێنانی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی ڕاسپێردراو لە پێکهێنانی وەزارەتەکەی دا لەو ماوەیەی کە لە برگەی (دوو) دا دەقنووس کراوە، لەماوەی پازدە ڕۆژ دا سەرۆکی کۆمار پالێوراوێکی نوێ ڕادەسپێرێت بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران.

چوارەم ـ سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی ڕاسپێردراو ناوی ئەندامانی وەزارەتەکەی و پڕۆگرامی وەزارەتەکەی دەخاتە بەردەم ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە و بەمتمانە پێدراو دەژمێردرێت کاتێک کە وەزیرەکان بە تاك و پڕۆگرامی وەزارەتیش بەزۆرینەی ڕەها ڕەزامەندییان پێدەدرێت.

پێنجەم ـ ئەگەر وەزارەتەکە بڕوای پێ نەدرا سەرۆك کۆمار لەماوەی پازدە ڕۆژ دا پالێوراوێکی دی بۆ پێکهێنانی وەزارەت ڕادەسپێردرێت.

**ماددەی ( 74 )**

یەکەم ـ مەرجە بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران هەمان ئەو مەرجانەی تیا دا بەدی بکرێت کە بۆ سەرۆك کۆمار دانراون و دەبێ بەڵگەنامەی زانکۆ یان هاوتاکەی هەبێت و تەمەنی سی و پێنج ساڵی تەواو کردبێت.

دووەم ـ مەرجە بۆ وەزیر هەمان ئەو مەرجانەی هەبێت کە بۆ پالێوراوانی ئەنجوومەنی نوێنەران دانراون و بەڵگەنامەی زانکۆ یان هاوتاکەی هەبێت.

**ماددەی ( 75 )**

سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران بەرپرسیاری ڕاستەوخۆی سیاسەتی گشتی دەوڵەتەو فەرمانەدەی گشتی هێزە چەکدارەکانە و بەکارگێڕیی ئەنجوومەنی وەزیران هەڵدەستێت و سەرۆکایەتی

کۆبوونەوەکانی دەکات و مافی لادانی وەزیرەکانی هەیە بەرەزامەندی ئەنجوومەنی نوێنەران.

**ماددەی ( 76 )**

سەرۆك وئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران بەو شێوەی کە لە ماددەی (48)ی ئەم دەستوورە دا دەقنووس کراوە لە بەردەم ئەنجوومەنی نوێنەراندا سوێندی دەستووریی دەخۆن.

**ماددەی ( 77 )**

ئەنجوومەنی وەزیران ئەم دەسەلاّتانە پیادە دەکات:

یەکەم ـ پلان دانان و جێبەجێکردنی سیاسەتی گشتی دەولّەت و پلانە گشتیەکان و سەرپەرشتی کردنی کاری وەزارەتەکان و ئەو لایەنانەی کە بە هیچ وەزارەتێکەوە نەبەستراونەتەوە.

دووەم ـ پێشنیازکردنی پرۆژەی یاساکان.

سێ یەم ـ دەرچواندنی سیستەم و رێنمایی و بریارەکان بە ئامانجی جێبەجێکردنی یاساکان.

چوارەم ـ ئامادەکردنی پرۆژەی بودجەی گشتی و ژمێرکاریی کۆتایی و پلانەکانی گەشەسەندن.

پێنجەم ـ راسپاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ رەزامەندیی لەسەر دامەزراندنی بریکاری وەزارەت و بالّیۆز و خاوەن پلە تایبەتییەکان و سوپا سالاری سوپا و یاریدەدەرانی و ئەوانەی کە لە پۆستی سەرکردەی تیپ (قائد فرقة ) و بەرەو ژوورن و سەرۆکی دەزگای هەوالگری نیشتمانی و سەرۆکی دەزگا ئەمنییەکان.

شەشەم ـ دانوستاندن سەبارەت بە پەیماننامەو رێککەوتنە نێودەولّەتییەکان و ئیمزا کردنیان بەخۆیەوە یان رایاندە سپێرێت.

**ماددەی** ( 78 )

یەکەم ـ سەرۆك كۆمار جێگەی سەرۆكی ئەنجوومەنی وەزیران دەگرێتەوە کاتێك بەهەر هۆیەك پۆستەکەی چۆڵ دەبێت.

دووەم ـ دەبێ سەرۆك كۆمار پاڵێوراوێکی دیکە بۆ پێکهێنانی وەزارەت لە ماوەی پازدە ڕۆژ دا رابسپێرێت ، بە پێی حوکمەکانی ماددەی (73)ی ئەم دەستوورە.

**ماددەی** ( 79 )

مووچەو دەرماڵەی سەرۆك و ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران و ئەوانەی لە پلەی ئەواندان بە یاسا رێك دەخرێت.

**ماددەی** ( 80 )

بەر پرسیارییەتی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و وەزیرەکان لە بەردەم ئەنجوومەنی نوێنەراندا وەك دەستەو تاکە کەسی (تضامنية و شخصية) دەبێت.

**ماددەی** ( 81 )

یەکەم ـ کاری دەزگا ئەمنییەکان و دەزگای هەواڵگری نیشتمانی بە یاسا رێك دەخرێت و ئەرك و دەسەلاتەکانی دەستنیشاندەکرێت و بەپێ ی سەرەتاکانی مافی مرۆڤ کاردەکەن و دەخرێتە ژێر چاودێریی ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە.

دووەم ـ دەزگای هەواڵگری نیشتمانی بە ئەنجوومەنی وەزیران دەبەسترێتەوە.

**ماددەی** ( 82 )

ئەنجوومەنی وەزیران پەیرەوێکی ناوەخۆ دادەنێت بۆ رێکخستنی کارو بار تیایدا.

**ماددەی ( 83 )**

پێکهێنانی وەزارەتەکان و کارو پسپۆریی و دەسـەڵاتەکانی وەزیـر بەیاسایەك ڕێك دەخرێت .

## بەندی سێ یەم
## دەسەڵاتی دادوەریی

**ماددەی ( 84 )**

دەسەڵاتی دادەوەری سەر بەخۆیە و دادگاکان به جیـاوازی جـۆرو پلەکانیانــەوە پێــی هەڵدەســتن و حوکمــەکانی بــەپێی یاســا دەردەچوێنێت.

**ماددەی ( 85 )**

دادوەرەکان لە دادوەرییاندا سەر بە خـۆن و جگـە لـە یاسـا هـیچ دەسەڵاتێکی دیکەیان بەسەرەوە نییە و نابێت هـیچ دەسـەڵاتێکی دیکە دەست لە دادوەریی و کارو باری دادپەروەریی وەربدات .

**ماددەی ( 86 )**

دەسەڵاتی دادوەریی فیدراڵ پێکدێت لە ئەنجوومەنی دادوەریی باڵا و دادگای فیدراڵیی باڵا و دادگـای تـەمییزی فیـدراڵی و دەزگـای داواکــاریی گشــتی و دەســتەی سەرپەرشــتیاریی دادوەریــی و دادگاکانی دیکەی فیدراڵی کە بە پێ ی یاسا ڕێك دەخرێت .

### یەکەم : ئەنجوومەنی دادوەریی باڵا

**ماددەی ( 87 )**

ئەنجوومــەنی دادوەریــی بــاڵا کــارو بــاری بــەڕێوە بردنــی دەســتە دادوەرییــەکان دەگرێتــە ئەســتۆ و یاســا شــێوەی پێکهاتــە و دەسەڵاتەکان و ڕێسای بەڕێوە چوونی کار تیایدا دیاری دەکات.

**ماددەی ( 88 )**

ئەنجوومەنی دادوەریی باڵا ئەم دەسەڵاتانە پیادە دەکات :

یەکەم ـ بەڕێوە بردنی کارو باری دادوەریی و سەرپەرشتی کردنی دادوەریی فیدراڵی.

دووەم ـ پاڵاوتنی سەرۆکی دادگای تەمییزی فیدراڵی و ئەندامەکانی و سەرۆکی داواکاری گشتی و سەرۆکی دەستەی سەرپەرشتیاریی دادوەریی و خستنە بەردەمی ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ رەزامەندیی لەسەر دامەزراندنیان.

سێ یەم ـ پێشنیاز کردنی پرۆژەی بودجەی ساڵانەی دەسەڵاتی دادوەریی فیدراڵی و خستنە بەردەم ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ رەزامەندیی لەسەر دان.

## دووەم: دادگای فیدراڵی باڵا

**ماددەی** ( 89 )

یەکەم ـ دادگای فیدراڵی باڵا دەستەیەکی دادوەریی سەر بە خۆیە لە رووی دارایی و کارگێڕییەوە .

دووەم ـ دادگای فیدراڵی باڵا لە ژمارەیەك لە دادوەر و شارەزا لە فیقهی ئیسلامی و شارەزایانی یاسا پێك دێت و ژمارە و جۆری دەستنیشان کردنیان و کاری دادگاکە بە یاسایەك دیاریدەکرێت کەلە لایەن ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران بەزۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران دەردەچێت.

**ماددەی** ( 90 )

دادگای فیدراڵی باڵا ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:

یەکەم ـ چاو دێریی کردنی دەستووریی بوونی یاساکان و پەیڕەوە کار پێکراوەکان.

دووەم ـ راڤەکردنی دەقە دەستوورییەکان.

سێ یەم ـ یەکلا کردنەوەی ئەو کێشانەی کە لە جێبەجێکردنی یاسا و بڕیار و سیستەم و ڕێنمایی و ڕێوشوێنە فیدڕالیەکان پەیدا دەبێت و یاسا مافی تانووت لێدانی ڕاستەوخۆ بۆ هەریەك لە ئەنجومەنی وەزیران و پەیوەستدارەکان لە بەردەم دادگادا دەستەبەر دەکات.

چوارەم ـ یەکلا کردنەوەی ئەو ناکۆکیانەی کە لە نێوان حوکومەتی فیدراڵ و حوکومەتەکانی هەرێمەکان و پارێزگاکان و شارەوانیەکان و بەڕێوبەرایەتیە خۆ جێیەکان روو دەدەن.

پێنجەم ـ یەکلا کردنەوەی ئەو ناکۆکیانەی کە لە نێوان حوکومەتەکانی هەرێمەکان یان پارێزگاکان روودەدەن.

شەشەم ـ یەکلا کردنەوەی ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی سەرۆکی کۆمارو سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و وەزیرەکان دەکرێت، ئەویش بە یاسا ڕێکدەخرێت.

حەوتەم ـ پەسەند کردنی دەرنجامە کۆتاییەکانی هەڵبژاردنی گشتی بۆ ئەندامیەتی ئەنجوومەنی نوێنەران.

هەشتەم ـ

أ. یەکلا کردنەوە کێشەی تایبەمەندیی لە نێوان دادوەریی فیدرالی و دەستە دادوەرییەکانی هەرێمەکان و ئەو پارێزگایانەی لە هەرێم رێك نەخراون.

ب- یەکلاکردنەوەی کێشەی تایبەتمەندیی نێوان دەستە دادوەرییەکانی هەرێمەکان یان ئەو پارێزگانەی لە هەرێمێکدا ڕێك نەخراون.

**ماددەی ( 91 )**

بڕیارەکانی دادگای فیدڕالی بالا بنبڕەو هەموو دەسەلاتەکان پابەندن پێیەوە .

## سێ یەم : حوکمە گشتی یەکان

**ماددەی ( 92 )**

ڕێگە بە دامەزراندنی دادگای تایبەتی و نا ئاسایی (استثنائي) نادرێت.

**ماددەی ( 93 )**

پێکهاتەی دادگا و جۆر و پلە و تایبەتمەند ییەکانی و چۆنیەتی دامەزراندن و خزمەتی دادوەران و ئەندامانی داواکاری گشتی و دیسپلینەکانیان و خانەنشین کردنیان بە یاسا ڕێکدەخرێت.

**ماددەی ( 94 )**

نابێت دادوەرەکان لە کار لابدرێن جگە لەو حاڵەتانەی کە یاسا دەستنیشانیان دەکات و هەروەها یاسا حوکمی تایبەت بەوان دیاری دەکات و لێ پرسینەوەی تەمێکردنیان ڕێکدەخات.

**ماددەی ( 95 )**

ئەمانەی خوارەوە بۆ دادوەر و ئەندامانی داواکاری گشتی قەدەغەن:

یەکەم ـ کۆکردنەوەی لە نێوان وەزیفەی دادوەریی و کارەکانی یاسا دانان و جێبەجێکردن یان هەر کارێکی دی لەیەککاتدا.

دووەم ـ چوونە ڕیزی هەر حزب و ڕێکخراوێکی سیاسی یان کارکردن لە هەر چالاکیەکی سیاسی دا.

**ماددەی ( 96 )**

دادوەریی سەربازی بەیاسا ڕێکدەخرێت و تایبەتمەندێتی دادگا سوپاییەکان کە ئەو تاوانانە دەگرێتەوە کە شێوەی سوپاییان هەیە

و له نێوان تاکەکانی هیزی چەکدارو هێزەکانی ئاسایش روو دەدات و لەو سنوورەی کە یاسا بڕیاری لەسەردەدات، دیاریدەکرێت.

**ماددەی ( 97 )**

ڕێگە بە هیچ دەقێك نادرێت لە یاساکاندا کە ببێتە پاراستەی هەر کارێك یان بڕیارێکی کارگێڕیی بۆ ئەوەی تانوتی لێنەدرێت.

**ماددەی ( 98 )**

دەکرێ بە یاسایەك ئەنجوومەنێکی دەوڵەت کە تایبەتمەند بێت بە فەرمانەکانی دادوەریی، کارگێریی ، فەتوا دان. دارشتنەوە و نوێنەرایەتی کردنی دەوڵەت و هەموو دەستە گشتیەکان لە بەردەم لایەنە دادوەریەکاندا دابمەزرێت جگە لەو شتانەی کە بە یاسا لیَ ی جیا کراونەتەوە.

## بەندی چوارەم

### دەستە سەربەخۆکان

**ماددەی ( 99 )**

کۆمسیۆنی بالأی مافی مرۆڤ و کۆمسیۆنی بالأی سەر بە خۆ بۆ هەڵبژاردنەکان و دەستەی دەستپاکی، دەستەی سەربەخۆن ودەخرێنە ژێر چاو دێریی ئەنجوومەنی نوێنەران و کارەکانیان بە یاسا ڕێکدەخرێن .

**ماددەی ( 100 )**

یەکەم ـ هەر یەك لە بانکی ناوەندیی عێراق و دیوانی چاو دێریی دارایی و دەستەی ڕاگەیاندن و گەیاندن و دیوانەکانی ئەوقاف، دەستەی دارایی و کارگێریی سەر بە خۆن و کاری هەر دەستەیەك بە یاسا ڕێکدەخرێت.

دووەم ـ بانكی ناوەندیی عێراق بەرپرسیارە لـە بـەردەم ئەنجوومـەنی نوێنەرانداو دیوانی چاودێریی دارایی و دەسـتەی ڕاگەیانـدن و گەیاندن سەر بە ئەنجوومەنی نوێنەرانن.

سێ یەم ـ دیوانەكانی ئەوقاف سەر بە ئەنجوومەنی وەزیرانن.

**ماددەی ( 101 )**

دەستەیەك بەناوی دەزگای شەهیدان سەر بە ئەنجوومـەنی وەزیـران دادەمەزرێت و كارو تایبەتمەندییەكانی بە یاسا ڕێكدەخرێت.

**ماددەی ( 102 )**

دەسـتەیەكی گشـتی بـۆ زامنكردنـی مـافی هەرێمـەكان و ئـەو پارێزگایانەی كە خۆیان لە هەرێمێكدا ڕێكنەخستووە بۆ بەشـداری كردنێكـی دادپەروەرانـە لـە بـەڕێوە بردنـی دەزگـا جیاجیاكـانی دەوڵـەتی فیـدرالی و (البعثـات والزمـالات الدراسـية) و شـاند و كۆنگرە هەرێمایەتیی و نێودەوڵەتییەكان و دەستەكە لە نوێنـەرانی حوكومەتی فیـدرالی و هەرێمـەكان و ئـەو پارێزگایانـەی كـە لـە هەرێمێك دا ڕێك نەخراون پێكدێو بەیاسا ڕێكدەخرێت.

**ماددەی ( 103 )**

بەیاسا دەستەیەكی گشتی بۆ چاو دێریی و تەرخانكردنی داهـاتی فیدڕالی دادەمەزرێت و ئەم دەستەیە لـە شـارەزایانی حوكومـەتی فیدڕالی و هەرێمەكان و پارێزگاكان و لە نوێنـەرەكانیان پێكـدێت وسەر پەرشتی ئەم بەرپرسیاریەتییانەی خوارەوە دەكات:

یەكەم ـ دڵنیا بوون لە دادپەروەریی دابەشكردنی بەخشین و یارمەتی و قەرزی نێودەوڵەتی بە گوێرەی بەركەوتنی هـەر هـەرێمێك و ئەو پارێزگایانەی لە هەرێمێك دا ڕێكنەخراون .

دووەم ـ دڵنیا بوون لە باشترین شێوەی بەکار هێنانی دەرامەتی دارایی فیدراڵی و دابەش کردنی .

سێ یەم ـ زامنکردنی روونیی و ئاشکرایی و دادپەروەریی لە تەرخانکردنی سامانەکان بۆ حوکومەتی هەرێمەکان یان ئەو پارێزگایانەی کە لە هەرێمێکدا ڕێك نەخراون بە گوێرەی ئەو ڕێژەیەی کەبڕیاری لە سەر دراوە .

**ماددەی ( 104 )**

ئەنجوومەنێك بەناوی ئەنجوومەنی خیدمەی گشتی فیدراڵی دادەمەزرێت ڕێکخستنی کارو باری وەزیفەی گشتی فیدرالی دەگرێتە ئەستۆ بە دامەزراندن و بەرز کردنەوەی پلەیشەوە و پێکهاتەو پسپۆرییەکانی ئەنجومەنەکەیش بە یاسا ڕێکدەخرێت.

**ماددەی ( 105 )**

دەکرێ دەستەی سەر بە خۆی نوێی دیکە بەپێی پێداویستی و زەرورەت بە یاسایەك دابمەزرێت.

# بەشی چوارەم

## تایبەتمەندییەکانی دەسەلاتە فیدرالی یەکان

**ماددەی ( 106 )**

دەسەلاتە فیدراڵی یەکان، یەك پارچەیی عێراق و ئارامیی و سەر بەخۆیی و سەروەریی وسیستەمە فیدراڵیو دیموکراسییەکەی دەپارێزێت .

**ماددەی ( 107 )**

دەسەلاتە فیدرالی یەکان بەم دەسەلاتە حەصریانە تایبەتمەندە :

یەکەم ـ نەخشەکێشانی سیاسەتی دەرەوە و نوێنەرایەتی دیبلوماسی و دانوستاندنی پەیوەست بە ڕێکەوتن و پەیماننامە

نێودەوڵەتیەکان و سیاسەتی قەرزوەرگرتن و ئیمزا کردنی گرێبەست و رەسم کردنی سیاسەتی ئابووری و بازرگانی دەرەوەی پەیوەست بە سەروەریاتی.

دووەم ـ دانان و جێبەجێکردنی سیاسەتی ئاسایشی نیشتمانیی، بە دامەزراندن و بەڕێوە بردنی هێزەچەکدارەکانیشەوە، بۆ مەبەستی دابینکردنی پاراستنی و دەستەبەرکردنی ئارامیی و ئاسایشی سەرسنوورەکانی عیراق و بەرگری لێکردنیان.

سێ یەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتی دارایی و گومرگی و لە سککەدانی دراو و ڕێکخستنی سیاسەتی بازرگانی بەڕێگای سنووری هەرێمەکان و پارێزگاکان لە عێراق دا و دانانی بودجەی گشتی بۆ دەوڵەت و نەخشە دانانی سیاسەتی دراوو دامەزراندنی بانکی مەرکزی و بەڕێوە بردنی.

چوار ـ ڕێکخستنی کارو باری پێوان و کێشان و سەنگەکان.

پێنجەم ـ ڕێکخستنی کاروباری رەگەزنامە و بە هاولاتی بوون و ئیقامە و پەنابەری سیاسی.

شەشەم ـ ڕێکخستنی سیاسەتی شەپۆلەکانی پەخش و پۆستە.

حەوتەم ـ دانانی پرۆژەی بودجەی گشتی و وەبەرهێنان.

هەشتەم ـ دارشتنی سیاسەتەکانی پێوەست بەو ئاوانەی کە سەرچاوەکانیان لە دەرەوەی عێراقدان، بە مەبەستی دابینکردنی هاتنی رێژەیەکی بەردەوامی ئاو بۆ عێراق و دابەشکردنی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لە ناو عێراقدا بەپێی یاساکان و دابە نێودەوڵەتییەکان.

نۆیەم ـ ئامارو سەرژمێری گشتی دانیشتوان.

**ماددەی ( 108 )**

نەوت وگاز مولکی هەموو گەلی عێراقە لە هەموو هەرێم و پارێزگاکان دا.

**ماددەی ( 109 )**

یەکەم ـ حوکومەتی فیدرال هەڵدەستێت بە بەڕێوەبردنی نەوت و گازی دەرهێنراو لە کێلگەکانی ئێستا دا لەگەڵ حوکومەتەکانی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکان دا بە مەرجێ داهاتەکانی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەش بکرێت کە بگونجێت لەگەڵ دابەش بوونی دانیشتوان لە هەموو ناوچەکانی وڵاتدا و لەگەڵ دیاری کردنی بەشێك بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بۆ هەرێمە زیان لێ کەوتوەکان کە لە لایەن ڕژێمی پێشووەوە بە شێوەیەکی بێ دادیی بێبەشکراون و زیانیان لێ کەوتووە دوای ئەوە، بەجۆرێك پەرەپێدانی هاوسەنگ بۆ هەموو ناوچە جیاجیاکانی وولات دابینبکات و ئەمەش بە یاسا ڕێکدەخرێت.

دووەم ـ حوکومەتی فیدراڵی و حوکومەتەکانی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکان بەیەکەوە هەڵدەستن بە نەخشە کێشان بۆ ستراتیژیە پێویستەکان بۆ بەرەو پێشەوە بردنی سامانی نەوت و گاز بە جۆرێك بەرزترین سوود بۆ گەلی عێراق بەدێبێنێت بە پشت بەستن بە نوێترین تەکنەلۆژیا و پرەنسیپەکانی بازاڕو هاندانی وەبەرهێنان.

**ماددەی ( 110 )**

ئەو تایبەتمەندییانەی خوارەوە هاوبەشن لە نێوان دەسەڵاتی فیدراڵی و دەسەڵاتی هەرێمەکاندا:

یەکەم ـ بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی گومرگەکان بە هەما هەنگی لە
گەڵ حکومەتەکانی هەرێم و ئەو پارێزگایانەی کە لە هەرێمێك ڕێکنەخراون، ئەمەش بە یاسایەك ڕێك دەخرێت .

دووەم ـ ڕێکخستنی سەرچاوە سەرەکییەکانی وزەی کارەبا و دابەشکردنی .

سێ یەم ـ نەخشەکێشانی سیاسەتی ژینگەیی بۆ مسۆگەر کردنی پاراستنی ژینگە لە پیس بوون و پارێزگاری لە پاك و خاوێنی بە هاوکاری لەگەڵ هەرێمەکان و ئەو پارێزگایانەدا کە لە هیچ هەرێمێك ڕێکنەخراون . ١

چوارەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتەکانی گەشە سەندن و پلاندانانی گشتی .

پێنجەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتی تەندروستی گشتی بەهاوکاری لەگەڵ هەرێم و ئەو پارێزگایانەی کە لە هەرێمێك دا ڕێکنەخراون.

شەشەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتی فێرکردن و پەروەردەی گشتی بەڕاوێژکردن لەگەڵ هەرێم و ئەو پارێزگایانەی کە لە هەرێمێك ڕێکنەخراون.

حەوتەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتی پەیوەست بە سەرچاوەکانی ئاوە ناخۆیەکان و ڕێکخستنیان بەجۆرێك کە دابەشکردنێکی دادپەروەرانەی مسۆگەر بکات و، ئەویش بە یاسا ڕێك دەخرێت.

**ماددەی ( 111 )**

هەر شتێك کە لە دەسەلآتی حەسریبۆ دەسەلآتەکانی فیدراڵی دەقنووس نەکرا بێت بە دەسەلآتی هەرێم و ئەو پارێزگایانەی لە هەرێم ڕێك نەخراون دادەنرێت و لە کاتی ناکۆکی دا لە

دەسەلاتەکانی تری هاوبەشی نێوان حوکومەتی فیدرال و هەرێمەکاندا یاسای هەرێمەکە کارپێکردنی بەپێش دەخرێت.

# بەشی پێنجەم

# دەسەلاتی هەرێمەکان

## بەندی یەکەم

## (هەرێمەکان)

**ماددەی** ( 112 )

سیستەمی فیدرالی لە کۆماری عێراق پێکدێت لە پایتەخت و هەرێمەکان و پارێزگا نامەرکەزییەکان و بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێییەکان.

**ماددەی** ( 113 )

یەکەم: ئەم دەستوورە لە کاتی جێبەجێ کردنیەوە هەرێمی کوردستان بەدەستەلاتەکانی ئێستاشیەوە بە هەرێمێکی فیدرالی دادەنێت.

دووەم : ئەم دەستووره دان بەو هەرێمە نوێیانە دادەنێت کە بە پێی حوکمەکانییەوە دادەمەزرێن.

**مادەدەی** ( 114 )

ئەنجومەنی نوێنەران لە ماوەیەك کە لە شەش مانگ تێپەر نەکات لە ڕۆژی یەکەم دانیشتنیەوە یاسایەك دادەنێت بەزۆرینەی سادە بۆ دیاری کردنی، ڕێکاری جێبەجێ کردنی تایبەت بە پێکهێنانی هەرێمەکان.

**ماددەی ( 115 )**

هەر پارێزگایەك یان زیاتر مافیان هەیە هەرێمێك پێك بێنن لە سەر داوایەك کە راپرسی لە سەر بکرێت بەیەکێ لەم دوو رێگایانە پێشکەش دەکرێت:

یەکەم: داوایەك لە سێ یەکی ئەندامانی هەر ئەنجوومەنێك لە ئەنجومەنەکانی ئەو پارێزگایانەی دەیانەوێت هەرێم پێك بێنن.

دووەم: داوایەك لە دەیەکی (10/1)ی دەنگدەران لەو پارێزگایانەی دەیانەوەێ هەرێم پێك بهێنن.

**ماددەی ( 116 )**

هەرێم دەستوورێك بۆ خۆی دادەنێت کە دەسەڵات و ئەرکەکانی و شێوازەکانی کارپێکردنیان دیاری بکات بە جۆرێك ناکۆك نەبێت لەگەڵ ئەم دەستوورەدا.

**ماددەی ( 117 )**

یەکەم ـ دەسەڵاتی هەرێمەکان مافی پیادەکردنی دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەرییان هەیە بە پێی حوکمەکانی ئەم دەستوورە بەدەر لە دەسەڵاتە حەسرییەکانی دەسەڵاتی فیدرالی کە لەم دەستوورە داهاتووە .

دووەم ـ دەسەڵاتی هەرێم مافی هەموار کردنی یاسای فیدڕالی هەیە لە هەرێم دا لە حاڵەتێك ئەگەر ناکۆکی و نەگونجان هەبێت لە نێوان یاسای فیدڕالی و یاسای هەرێم سەبارەت بەو پرسەی کە ناچێتە ناو تایبەتمەندی یە حەسریەکانی دەسەڵاتە فیدرالیەکان.

سێیەم ـ لە داهاتە دەستکەوتووەکانی فیدڕالی دا بەشێکی دادپەروەرانە تەرخان دەکرێت بۆ هەرێمەکان و پارێزگاکان، کە بەشی بارگرانی و راپەراندنی ئەرکەکانی بکات بەڕەچاو کردنی داهات و پێداویستیەکان و ڕێژەی دانیشتوانی .

چوارەم ـ لە بالێوزخانەو نێردە دیبلۆماسییەکان دا نووسینگە بۆ هەرێم و پارێزگاکان دادەمزرێت بۆ بەدواداچوونی کاروباری رۆشنبیریی و کۆمەلآیەتی و بوژاندنەوەی ناوچەیی .

پێنجەم ـ حکومەتی هەرێم تایبەتمەندە بە هەموو پێداویستی‌یەکانی بەڕێوەبردنی هەرێم بە تایبەتیش دروست کردن و رێکخستنی هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆی هەرێم وەك پۆلیس و ئاسایش و پاسەوانی هەرێم .

## بەندی دووەم

## ئەو پارێزگایانەی خۆیان لە هەرێمێك دا رێك نەخستووە

### ماددەی ( 118 )

یەکەم ـ پارێزگاکان لە ژمارەیەك قەزا و ناحیە و گوند پێك دێن .

دووەم ـ ئەو پارێزگایانەی لە هەرێمێك دا رێك نەخراون دەسەلآتی ئیداری و دارایی فراوانیان پێ دەدرێت بە جۆرێك کە بتوانن کاروباری خۆیان بەڕێوەبەرن بە پێ ی پرەنسیپی نا مەرکەزی ئیداری و ئەویش بە یاسا رێك دەخرێت.

سێ یەم ـ ئەو پارێزگارەی کە ئەنجوومەنی پارێزگا هەلێدەبژێرێت بە سەرۆکی بالآی جێبەجێکردنی دەژمێردرێت لە پارێزگا بۆ پیادەکردنی ئەو دەسەلآتانەی کە لە لایەن ئەنجوومەنەوە پێیدراوە .

چوارەم ـ هەلبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگا و پارێزگار و تایبەتمەندییەکانیان بە یاسا رێك دەخرێت.

پێینجەم ـ ئەنجوومەنی پارێزگا مل کەچ نابێت بۆ کۆنترۆڵ و سەرپەرشتی کردن لەلایەن هیچ وەزارەت یان لایەنێك کە پەیوەندی لەگەڵ وەزارەتێك دا نەبێت و دارایی یەکی سەربەخۆی دەبێت .

**ماددەی** ( 119 )

دەکرێ دەسەڵاتەکانی حکومەتی فیدراڵی بدرێت بە پارێزگاکان یان بە پێچەوانەوە و بە رەزامەندی هەردوولا، ئەوەش بە یاسارێك دەخرێت.

## بەندی سێیەم
## پایتەخت

**ماددەی** ( 120 )

بەغداد بە سنووری شارەوانییەکەیەوە پایتەختی کۆماری عێراقە و بەسنووری ئیدارییەکەشی پارێزگای بەغداد دەنوێنێ و باری پایتەخت بە یاسا رێك دەخرێت ونابێت پایتەخت بچێتە ناو هیچ هەرێمێکەوە .

## بەندی چوارەم
## ئیدارە خۆجێییەکان

**ماددەی** ( 121 )

ئەم دەستوورە مافە ئیداری وسیاسی و رۆشنبیرییەکان و فێرکردن مسۆگەر دەکات بۆ نەتەوە جیاکان وەك تورکمان ، کلدان و ئاشووری و هەموو پێکهاتەکانی دی، ئەویش بە یاسا رێك دەخرێت.

# بەشی شەشەم

# حوكمەكانی كۆتـايی و گواستنەوە

## بەندی یەكەم

## حوكمە كۆتایی یەكان

**ماددەی ( 122 )**

یەكەم ـ سەرۆكی كۆمار و ئەنجوومەنی وەزیران بەیەكەوە ، یان پێنج یەكی (5/1)ی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران بۆیـان هەیـە پێشنیاری هەمواركردنی دەستوور بكەن.

دووەم ـ نابێ پرەنسیپە بنچینەیی یـەكانی بەشـی یەكـەم و مـاف و ئازادیەكانی لە بەشـی دووەمـی دەسـتوور هـەموار بكـرێن، مەگەر دوای دوو خولی هەڵبژاردنی یـەك بـە دوای یـەك دا و لەسەر رەزامەندیی دوو لە سەر سـێ ی (3/2)ی ئەنـدامانی ئەنجوومەنی نوێنەران، وەلەسەر رەزامـەندیی گەل بـە راپرسـی یەكی گشتی، و پەسەند كردنی سـەرۆكی كۆمـار لـە مـاوەی حەوت ڕۆژ دا بێت.

سێ یەم ـ نـابێ ماددەكـانی تـری كـە لـە برگـەی "دووەم"ی ئـەم ماددەیـــەدا نـــەهاتوون هـــەموار بكـــرێن ، مەگـــەر دوای رەزامەنـــدیی دوو لەســـەر ســـێ ی (3/2)ی ئەنـــدامانی ئەنجوومەنی نوێنەران، و لەسەر رەزامەندی گـەل بـە راپرسـی گشتی و پەسەندكردنی سەرۆك كۆمار لە ماوەی حەوت ڕۆژ دا بێت.

چوارەم ـ نابێ هیچ هەموار كردنێك بۆ ماددەكانی دەسـتوور بكـرێ كـە دەسـەڵاتی هەرێمـەكان كـەم بكاتـەوە كـە ناچـێتە نـاو تایبەتمەندیە دیاریكراوەكانی دەسەڵاتی حەسری فیدراڵی تەنها

به ڕەزامەندیی دەسەلاَتی یاسادانانی هەرێمە پەیوەندداره‌کە نەبێت و بە ڕەزامەندیی زۆرینەی دانیشتوانەکەی وبە ڕاپرسی یەکی گشتی.

پێنجەم -

أ- هەموار کردن بە پەسەندکراو دادەنرێت لە لایەن سەرۆك کۆمار دوای تەواو بوونی ئەو ماوەیەی کە دەقنووس کراوە لە بڕگەی (دووەم) و (سێ یەم )ی ئەو ماددەیەدا لە کاتی پەسەندنەکرانی دا.

ب-هەموارکردنەکە لە ڕۆژی بلاَوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی فەرمی دا بە جێبەجێکراو دەژمێردرێت.

**ماددەی** ( 123 )

نابێ سەرۆك کۆمار و سەرۆك و ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران و سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و هەردوو جێگر و ئەندامەکانی و ئەندامانی دەسەلاَتی دادوەری و خاوەن پلە تایبەتەکان بۆیان نیە پلەو پایەیان بقۆزنەوە بۆ کڕین یان بەکرێ دانی یان پێ فرۆشتنی شتێك لە سامانی خۆیان یان (گۆڕینەوەیان) یان گرێ بەستێك لەگەلّ دەولّەت مۆربکەن بەسیفەتی پابەندبوونیان، هێنەر یان بەلّێندەر.

**ماددەی** ( 124 )

یاسا و حوکمە دادوەری یەکان بەناوی گەلەوە دەردەچن.

**ماددەی** ( 125 )

یاساکان لە ڕۆژنامەی فەرمی دا بلاَودەکرێنەوە و لە مێژووی بلاَوکردنەوەیاندا کاریان پێ دەکرێت ، مەگەر دەقێکی پێچەوانەی نووسرابێت.

**ماددەی ( 126 )**

یاسا بەرکارەکان بەکارپێکراوی دەمێننەوە مادامەکی هەڵنەوەشێنرابنەوە یان هەموار نەکرابن بەپێی حوکمەکانی ئەم دەستوورەوە.

**ماددەی ( 127 )**

هەموو ئەو راپرسیەیانەی کە لەم دەستوورەدا هاتوون بە رەزامەندیی زۆرینەی سادەی دەنگدەران دروستن مەگەر دەقێکی پێچەوانەی بۆ نووسراو بێت.

## بەندی دووەم
## حوکمە گواستراوەکان

**ماددەی ( 128 )**

یەکەم ـ دەوڵەت چاودێریی زیندانییە سیاسی یەکان و زیان لێکەوتووانی کردارە نارەواکانی رژێمی دیکتاتۆری لە ناو براو دەستەبەر دەکات.

دووەم ـ دەوڵەت قەرەبوی خێزانی شەهیدان و بریندارەکان لە دەرەنجامی کردارە تیرۆریستی یەکان دەستەبەر دەکات .

سێ یەم ـ ئەوەی لە برگەی (یەکەم ) و (دووەم )ی ئەم بەندەدا هاتووە بە یاسا رێك دەخرێ.

**ماددەی ( 129 )**

ئەنجوومەنی نوێنەران لە دانیشتنی یەکەمی دا کاربە پەیرەوی ناوخۆی کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ ماوەی گواستنەوە دەکات ، تا ئەو کاتەی پەیرەوێکی ناوخۆ بۆ خۆی دادەنێت .

**ماددەی ( 130 )**

دادگای سزای باڵای عێراقی بەردەوام دەبێت لە کارەکانی دا وەکو دەستەیەکی دادوەریی سەربەخۆ ، بۆ روانینی لە تاوانەکانی

حوکمی دیکتاتۆری لە ناو براو و دارودەستەکەی، و ئەنجوومەنی نوێنەران بۆی هەیە دوای تەواو بوونی کارەکانی دادگاکە بە یاسا هەڵیبوەشێنێتەوە.

**ماددەی** ( 131 )

یەکەم ـ دەستەی نیشتمانیی بالاّ بۆ ڕیشەکێش کردنی بەعس بەردەوام دەبێت لە کارەکانی دا وەکو دەستەیەکی سەر بە خۆ، و بە هەماهەنگی لەگەڵ دەسەلاّتی دادوەریی و دەزگاکانی جێبەجێکردن و لە چوارچێوەی ئەو یاسایانەی کە کارەکانی ڕێك دەخات ، بە ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە پەیوەست دەبێت.

دووەم ـ ئەنجوومەنی نوێنەران بۆی هەیە ئەم دەستەیە دوای تەواو بوونی کارەکەی بە زۆرینەی دوو لەسەر سێ ی (3/2)ی ئەندامەکانی هەڵوەشێنێتەوە.

سێ یەم ـ مەرجە پالێوراو بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار و سەرۆك و ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران و سەرۆك و ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران و سەرۆك و ئەندامانی ئەنجوومەنی فیدراڵ و پایە هاوپلەکان لە هەرێمەکاندا و ئەندامانی دەستە دادوەریەکان، و پلە و پایەکانی دی کە بڕیاری ڕیشەکێشکردنی بەعس دەیانگرێتەوە بە پێی یاسا، نابێ لەو کەسانە بن کە حوکمی ڕیشەکێشکردنی بەعس دەیانگرێتەوە.

چوارەم ـ ئەو مەرجەی کە لە بڕگەی (سێیەم)ی ئەو بەندە دا هاتووە بەردەوام کاری پێ دەکرێت تا بە یاسا هەڵدەوەشێتەوە .

**ماددەی** ( 132 )

یەکەم ـ دەستەی داواکانی موڵکداری بەردەوام دەبێت لە کارەکانی دا وەکو دەستەیەکی سەر بە خۆ و بە هەماهەنگی لەگەڵ

دەسەلاتی دادوەریی و دەزگاکانی جێبەجێکردن دا و بە پیێ ی یاسا ، پەیوەست دەبێت بە ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە .

دووەم ـ ئەنجوومەنی نوێنەران بۆی هەیە بە زۆرینەی دوو لە سەر سێ ی (3/2)ی ئەندامانی، دەستەکە هەڵوەشێنێتەوە .

**ماددەی** ( 133 )

حوکمەکانی تایبەت بە ئەنجوومەنی فیدراڵ لە هەر شوێنێکی ئەم دەستوورە دا هاتبێت کارپێکردنیان دوا دەخرێت تا ئەو کاتەی بڕیارێك لە ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە دەردەچێت بە زۆرینەی دوو لەسەر سێ ی (3/2)ی ئەندامان لە خولی دووەمی هەڵبژاردنەکانی دا کە دوای بەرکاربوونی ئەم دەستووره داسازیدەدات.

**ماددەی** ( 134 )

یەکەم ـ دەستەواژەی (ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی) جێ ی دەستەواژەی (سەرۆکی کۆمار) دەگرێتەوە لە هەر شوێنێك کە لەم دەستوورەدا باس کرا بێت و دووبارە کار دەکرێتەوە بە حوکمە تایبەتی یەکانی سەرۆکی کۆمار دوای یەك خولی داهاتوو لە دوای کارپێکردنی ئەم دەستوورەدا .

دووەم ـ

أ- ئەنجوومەنی نوێنەران سەرۆکێك بۆ دەوڵەت و دوو جێگری بۆ هەڵدەبژێریت کە بەیەکەوە ئەنجوومەنێك پێك دەهێنن پیێ ی دەوترێت (ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی ) و بەیەك لیست و زۆرینەی (3/2) هەڵدەبژێردرێن .

ب- حوکمەکانی لابردنی سەرۆك کۆمار کە لەم دەستوورە دا هاتووە سەرۆك و ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیش دەگرێتەوە .

ج- ئەنجوومەنی نوێنەران بۆی هەیە هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی لا بدات بە زۆرینەی (4/3)ی ئەندامەکانی بە هۆی ناشایستەیی یان ناپاکی.

د- لەکاتی چۆل بوونی هەر پۆستێکی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی، ئەنجوومەنی نوێنەران بە زۆرینەی (3/2)ی ئەندامانی کەسێکی دی لە جیاتی ئەو هەڵدەبژێرن .

سێ یەم ـ مەرجە ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی هەمان مەرجەکانی ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی تیادا بێت، بە مەرجێ کە:

أ- چل ساڵ لە تەمەنی تەواو کردبێت.

ب-ناوبانگی باش و دەست پاکی و راستەرۆیی هەبێت .

ج- حیزبی بەعسی هەڵوەشاوەی جێ هێشتبێت بەر لە (دە) ساڵ لە رووخانی، ئەگەر تیایدا ئەندام بووبێت.

د- نابێ بەشداریکردبێت لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ساڵی (1991) و ئەنفالەکان و تاوانی ئەنجام نەدابێت دەرحەق بەگەلی عێراق.

چوارەم ـ ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی بڕیارەکانی بە کۆی دەنگ دەردەکات و هەر ئەندامێك دەکرێ یەکێ لە دوو ئەندامەکەی دی بەنوێنەری خۆی دابنێت.

پێنجەم ـ

أ- ئــەو ياســاو بڕيارانــەی ئەنجوومــەنی نوێنــەران دەری دەكات، ڕەوانەی ئەنجوومەنی سەرۆكايەتی دەكـرێن بـە مەبەسـتی ڕازی بـوون لـە سـەری بـە كـۆی دەنـگ و دەرچـواندنی لــە مــاوەی (دە) ڕۆژدا لــە ڕۆژی پــیٚ گەيشتنی، بەدەر لەوەی لە هەردوو مـاددەی (114) و (115) دا هــاتووە كــە پەيوەســتن بــە پێكهێنــانی هەرێمەكانەوە.

ب-لــە حالّــەتی وەرنــەگرتنی ڕەزامەنــدیی ئەنجوومەنی سـەرۆكايەتی، ياسـا و بڕيارەكـان دەگەڕێندرێنـەوە بـۆ ئەنجومەنی نوێنـەران بـۆ چـاوپێدا خشـاندنەوەی ئـەو لايەنەی كە نارەزايی يـان لەسـەر هەيـە و بـە زۆرينـە دەنگــی لەســەر بــدرێت و جــارێكی دی دەنێردرێتــەوە ئەنجوومەنی سەرۆكايەتی بۆ ڕەزامەنديی دان لە سەری.

ج- لــە حالّــەتی وەرنــەگرتنی ڕەزامەنــدیی ئەنجوومــەنی سەرۆكايەتی لەسەر ياسا و بڕيارەكان بۆ جاری دووەم لە ماوەی (دە) ڕۆژدا لە مێژووی گەيشـتنی دا، جـارێكی ديكە دەگەڕێتەوە بـۆ ئەنجوومــەنی نوێنـەران كـە بـۆی هەيە بڕياری لەسەر بدات بە زۆرينەی (5/3)ی ژمارەی ئەندامانی كە ناتواندریٚ نـارەزايی لەسـەر بـدریٚ و بـە پەسەند كراو دەژمێردرێت.

شەشەم ـ ئەنجوومەنی سەرۆكايەتی دەسەلاّتەكانی سەرۆك كۆمار پيـادە دەكات كە لەم دەستوورە دا هاتووە.

**ماددەی ( 135 )**

سەرۆكی ئەنجومەنی وەزيران لـە خـۆلی يەكـەمی هەلّبژاردنيـدا دوو جێگری دەبن.

## ماددەی (136)

یەکەم ـ دەسەلاتی جێبەجێکردن ئەو هەنگاوە پێویستانە دەگرێتە بەر بۆ تەواوکردنی جێبەجێکردنی پێداویستەکانی ماددەی (58) بە هەموو برگەکانیەوە لە یاسای ئیدارەی دەولەتی عێراقی بۆ قۆناغی گواستنەوە.

دووەم ـ ئەو بەرپرسیارێتی یەی دەکەوێتە ئەستۆی دەسەلاتی جێبەجێکردن لە حوکومەتی ئینتقالی دا کە لە ماددەی (58)ی یاسای ئیدارەی دەولەتی عێراق دا بۆ قۆناغی گواستنەوە دەقنووسکراوە درێژدەبێتەوە و بەردەوام دەبێت بۆ دەسەلاتی جێبەجێکردن کە بە پێ ی ئەم دەستوورە هەلبژێردراوە بۆ ئەوەی بە تەواوی ئەمانە ئەنجام بدەن (ئاسایی کردنەوە ، سەرژمێری، کە کۆتایی دێت بە راپرسی یەك لە کەرکوك و ئەو ناوچانەی دی کە کێشەیان لەسەرە بۆ دیاری کردنی ویستی هاولاتیانی) لە ماوەیەك دا کە لە (سی و یەکی) مانگی کانونی یەکەمی سالی دوو هەزار و حەوت تێپەرنەکات.

## ماددەی (137)

ئەو یاسانەی لە سالی (1992) بەولاوە لە هەرێمی کوردستان دانراون بەردەوام کاریان پێدەکرێت و هەموو بڕیارەکانی حوکومەتی هەرێمی کوردستان ـ بە بڕیارەکانی دادگا و گرێ بەستەکانیشەوە ـ کاریان پێ دەکرێت مەگەر هەموار بکرێت یان هەلبوەشێندرێنەوە بە پێ ی یاساکانی هەرێمی کوردستان لە لایەن لایەنی تایبەتمەندیەوە بەمەرجێك ناکۆك نەبن لە گەل دەستوور دا.

**ماددەی** ( 138 )

یاسای ئیدارەی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە و پاشکۆیەکەی لـە کاتی دەست بە کار بوونی حکومەتی نوێ دا هەڵدەوەشێتەوە جگە لــەوەی لــە بڕگــەی (أ)ی مــاددەی (53) و مــاددەی (58) یداهاتووە.

**ماددەی** ( 139 )

ئەم دەستورە بەکار پێکراو دەژمێردرێت دوای رەزامەندیی گەل بـە راپرسی گشتی( ریفراندۆم) لە سەری و بلآوکردنەوەی لە رۆژنامەی فەرمیدا و دەست بە کار بوونی حوکومەتی پێکهاتوو بە پێی ئەم دەستوورەوە.